**پرۆسەی پێکهێنانی سەرۆکایەتی هەرێم؟**
**نەوشیروان مستەفا**

یادداشتی رۆژانە
لێدوان
دۆکۆمێنت

**خولیای سەرۆکایەتی**

بەر لە روخانی سەدام کۆنگرەی موعارەزەی عیراقی لە لەندن بەسترا. ژمارەیەکی زۆر حیزب و رێکخراو و کەسایەتی عیراقی جیاواز بانگ کرا بون. سەرۆکی ئەمەریکی بوش نێردراوێکی تایبەتی خۆی بۆ ئەو کارە تەرخان کرد بو کە زالمای خەلیل زاد بو. خەلیل زاد رۆڵی سەرەکی هەبو لە بانگ کردن و رێکخستن و کۆکردنەوەی ئەو هەمو گروپە جیاوازانەدا.

ئەمانە هەندێکیان ئامادە نەبون لە گەڵ یەکتری و هەندێکیان بە بیانوی دەستێوەردانی ئەمەریکیەوە، کۆ ببنەوە. جەلال تاڵەبانی رۆڵێکی زۆری هەبو لەوەدا کە پێکەوە دابنیشن و باری سەرنجیان لە یەکتری نزیک بکاتەوە. خەلیل زاد، بە راستی بوبێ یان بە گاڵتە، ئەو کاتە بە جەلال تاڵەبانی وت بو: تۆ باشترین کەسی بۆ سەرۆکایەتی داهاتوی کۆماری عیراق. لەو کاتەوە تاڵەبانی ئەم قسەیەی لە لا بو بو بە خولیا. هەمو جار خۆی ئەیگێڕایەوە و بە کردەوەش هەوڵی بۆ ئەدا.

کە مەجلیسی حوکم دامەزرا، کێشەی سەرۆکایەتی هاتە ئاراوە. بیروبۆچونی جیاواز هەبو. ئاخۆ سەرۆکێک و دو جێگری هەبێ یان سەرۆکی نۆرەیی هەبێ. سەرەنجام لە سەر دانانی سەرۆکی نۆرەیی رێک کەوتن. هەم جەلال تاڵەبانی و هەم مەسعود بارزانی هەلیان بۆ رەخسا هەر یەکەیان بۆ ماوەی مانگێ ببن بە سەرۆکی مەجلیس. لەو ماوەیەدا کە تاڵەبانی سەرۆک بو رێککەوتنی لەگەڵ بریمەر ئیمزا کرد. کە بە پێی زەمانبەندیەکی دیاریکراو سەروەری بگەڕێتەوە بۆ عیراق.

قانونی ئیدارەی دەوڵەت نوسرا. گفتوگۆی گێڕانەوەی سەروەری دەستی پێ کرد. بە پێی ئەو قانونە ئەبو ئەنجومەنی سەرۆکایەتی پێک بهێنرێ. کابینەیەکی نوێ پێک بهێنرێ. ئەنجومەنێکی نیشتمانی دابمەزرێنرێ. ئەمانە هەموی بە دانان دائەنران نە بە هەڵبژاردنی گشتی.

لە گفتوگۆکاندا لایەنی یەکێتی بریتی بون لە: جەلال تاڵەبانی، د فوئاد مەعسوم، د بەرهەم ساڵح، عادل موراد.

لە مێژ بو تاڵەبانی بیرۆکەی دابەشکردنی پۆستەکانی عیراق و کوردستانی لە لا گەڵاڵە بوبو. چەند جارێ دا بوی بە گوێی ئێمەدا کە باسی بکەین لە گەڵ پارتی و، خۆیشی چەند جارێ دابوی بە گوێی د رۆژ شاوەیس و وشیار زێباری دا. رۆژ و

وشیار رازی نەئەبون بەو دابەشکردنە ئەیانویست لە هەردو شوێن خۆیان باڵادەس بن.

کە گفتوگۆی جدی دەستی پێ کرد بۆ گێڕانەوەی سەروەری عیراق و پێکهێنانی داودەزگا دەوڵەتیەکانی عیراق. لە دانانی ئەنجومەنی سەرۆکایەتی عیراق دا بریمەر رازی نەبو تاڵەبانی ببێ بە سەرۆکی کۆمار. بریمەر، بۆ راگرتنی هاوسەنگی لە نێوان پێکهاتە سەرەکیەکانی خەڵکی عیراق دا، پێی وابو:

پۆستی سەرۆکایەتی کۆمار ئەبێ بدرێ بە عەرەبێکی سونی.

پۆستی سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیران بدرێ بە عەرەبێکی شیعی.

پۆستی سەرۆکایەتی کۆمەڵەی نیشتمانیی عیراق بدرێ بە کورد.

تاڵەبانی بۆ کردن و نەکردنی ئەم پۆستە پرسی بە م س (م س: کورتکراوەی مەکتەبی سیاسیە) کرد. م س بە لایانەوە باش نەبو ئەم پۆستە وەربگرێ چونکە لە پایەی ئەو کەمترە. تاڵەبانی، خۆی حەزی ئەکرد وەری بگرێ، تەنانەت د مەحمود عوسمانی راسپاردبو قسە لە گەڵ م س یەکێتی بکا بۆ ئەوەی ئیقناعیان بکا، بەڵام لە بەر پێداگری م س تاڵەبانی روگیر بو پۆستەکەی وەرنەگرت.

ئەنجومەنی سەرۆکایەتی پێک هات لە: غازی شەمەری سەرۆکی کۆمار، د رۆژ شاوەیس و د ئیبراهیم جەعفەری، ئەندامی ئەنجومەنی سەرۆکایەتی.

د ئەیاد عەلاوی بو بە سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران و، د بەرهەم سالح بو بە جێگری سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران. وشیار زێباری بو بە وەزیری دەرە.

د فوئاد مەعسوم بو بە سەرۆکی کۆمەڵەی نیشتمانی و عارف تەیفور بە سەرۆکی فراکسیۆنی کوردی.

یەکێ لە کارەکانی ئەم داودەزگایانە ئەنجامدانی هەڵبژاردن بو بۆ کۆمەڵەی نیشتمانی.

هەلبژاردن بۆ کۆمەڵەی نیشتمانی عیراق، بۆ ئەنجومەنی نیشتمانی کوردستان، بۆ ئەنجومەنی پارێزگاکان ئەنجام درا. هەڵبژاردن بۆ کۆمەڵەی نیشتمانی عیراق، بۆ ئەنجومەنی نیشتمانی کوردستان هاوبەش بو. یەکێتی و پارتی و... لیستی هاوپەیمانی‌یان هەبو. بەڵام بۆ ئەنجومەنی پارێزگاکان یەکێتی لیستی خۆی و پارتی و هەندێ حیزبی تر لیستی خۆیان هەبو.

## 1 ی 12 ی 2004:

پیرمام، کۆبونەوەی هاوبەشی یەکێتی و پارتی بە ئامادەبونی مەسعود بارزانی و جەلال تاڵەبانی.

بارزانی و تاڵەبانی بە دوقۆڵی کۆبونەتەوە. دوای کۆبونەوەکە بۆ دەزگاکانی راگەیاندن دوان. لە بەردەم کامێرای تەلەفزیۆن‌دا، دو فایلیان گۆڕیەوە گۆیا پێک هاتون لە سەر ئەوەی سەرۆکایەتی بەغداد و کوردستان لە ناو خۆیان دا دابەش بکەن.

تاڵەبانی دەقی ڕێکەوتنەکەی پیشانی هیچ کام لە هاورێکانی: کۆسرەت ڕەسول، عومەر سەید عەلی، مستەفا سەید قادر، کە لەو سەفەرەدا لە گەڵی بون نەداوە، وەکو خۆیان وتیان، ڕەنگە لە ناو ئەوانەدا تەنیا عەدنان موفتی و ئازاد بەرواری خوێندبێتیانەوە. ڕەنگە هەر ئەوانیش ئامادەیان کرد بێ.

من نەچوبوم بۆ ئەو کۆبونەوەیە و ڕێککەوتنەکەشم نەدیوە و بڵاویش نەکرایەوە.

تێبینی بەشی زۆری ئەندامانی م س ئەوەیە: لە ڕوداوەکانی عیراقدا، لە دوای ڕوخانی سەدامەوە، گرنگترین شت بە لای تاڵەبانیەوە دابینکردنی شوێنی خۆیەتی لە دەوڵەتی عیراقی تازەدا: ببێتە سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیرانی عیراق یان سەرۆکی کۆمار. بۆ گەیشتن بەم ئامانجەش ئامادەی هەمو جۆرە تەنازولێکە. سەرانی پارتی، بە تایبەتی مەسعود بارزانی، ئەمەیان تێدا خوێندۆتەوە. زیرەکانە کەڵکی لێ وەرئەگرن.

ئەگەرچی ڕێککەوتنەکەیان تا ماوەیەکی درێژ دەرنەئەخست بەڵام سەرەنجام کۆپیەکمان دەس کەوت، کە لێرەدا ئەینوسمەوە.

**دەقی ڕێککەوتننامەی تاڵەبانی – بارزانی:**

بەناوی خوا

لە بەر بەرژەوەندی باڵای نیشتمانیی گەلی کوردستان وە سەرخستنی مەسەلە ڕزگاریخوازە ڕەواکەیداو، بۆ چەسپاندنی یەکبوونی ڕیزی گەلی کوردستان تاکو ڕۆڵی ئیجابی گرینگی خۆی لە عێراقی دیموکراتی فیدراڵدا ببینێت تا مافی نەتەوەییمان لە دەستووری هەمیشەیی عێراق و چارەسەری کێشەی کەرکوک و ناوچەکانی دیکەی تەعریب کراو بچەسپێت، هەروەها بۆ پتەو بوونی ئاسایش و ئارامی لە کوردستان، سەرکردایەتی هەردوولا، یەکێتی نیشتمانی کوردستان و پارتی دیموکراتی کوردستان، بڕیاریان دا وزەو هێزی خۆیان بەم شێوەیە یەک بخەن:

1) لە هەڵبژاردنی سەرانسەری پەرلەمانی عێراقدا، هەردوولا بە هاوکاری و هەماهەنگی پێکهاتەکانی نەتەوەیی کوردستان، بە کورد و تورکمان و کلدان و ئاشوورییەوە، لە یەک لیستی هاوبەشدا گشت حزب و هێزە سیاسییەکان بگرێتەوە، بە ڕێژەیەکی گونجاو لەسەر بنەمای تەبایی و ڕێککەوتن، خۆیان ڕێک بخەن.

2) هەروەها لە هەڵبژاردنی پەرلەمانی کوردستان (ئەنجومەنی نیشتمانی کوردستان) یشدا، ئەو لایەنانە لە یەک لیستی هاوبەشدا بەشداریی هەڵبژاردن بکەن.

3) ڕێککەوتن لەسەر شێوەی دابەش بوونی پلەی پەرلەمانی و حکومی لە عێراق و هەرێمی کوردستاندا بەم شێوەیە بێت:

أ. سەرۆکی هەرێمی کوردستان، بەڕێز مسعود بارزانی.

ب. یەکێک لە دوو مەوقیعی سیادی عێراق (سەرۆک کۆمار یان سەرۆکی وەزیرانی حکومەتی عێراق)، بۆ بەڕێز مام جەلال.

ج. سەرۆکی پەرلەمانی کوردستان، هەڤاڵێک لە یەکێتی نیشتمانی کوردستان بێت.

د. سەرۆکی حکومەتی هەرێمی کوردستان، هەڤاڵێک لە پارتی دیموکراتی کوردستان بێت.

بەم بۆنەیەوە هیواداریین کە گەلی کوردستان بە کورد و تورکمان و کلدان و ئاشووری و کەرت و توێژی کۆمەڵایەتی ڕۆشنبیرییەوە، پشتیوان و هاوکارمان بن لە پێناوی سەرخستنی مەسەلەی ڕەوای گەلەکەمان و زامن کردنی مافەکانی لە فیدراڵیزم و ئازادی و دیموکراتی و پێشکەوتنی کۆمەڵایەتیدا.

پشت بە خوای مەزن، ئایندەی گەشی میللەتەکەمان لە یەکبوونی ووزە و توانای هەموو لایەکماندا، مسۆگەر بێت.

تێبینی:

1) خاڵی (أ) و (ب) بەیەکەوە بەستراون.

2) ئەم ڕێککەوتنە تاکو هەڵبژاردنی داهاتوو و دانانی دەستووری دایم بەردەوام دەبێ.

| جەلال تاڵەبانی | مەسعود بارزانی |
|---|---|
| سکرتێری گشتی | سەرۆکی |
| یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان | پارتی دیمۆکراتی کوردستان |
| 2004/12/1 | |

بۆ گێڕانەوەی هەواڵی کۆبونەوەکە بڕوانە: کوردستانی نوێ، ژمارەی 3536 رۆژی 2 ی 12 ی 2004.

8 ی 12 ی 2004:

پیرمام، کۆبونەوەی هاوبەشی هەردو م س بە سەرپەرشتی مەسعود بارزانی.

لە پارتی: ئازاد بەرواری، محەمەد مەلا قادر، مەسعود ساڵەیی، رەمزی شەعبان.

لە یەکێتی: ئەرسەلان بایز، عەدنان موفتی، جەلال جەوهەر و بەندە.

بابەتی سەرەکی باسی هەڵبژاردنەکانی کوردستان و عیراق بو.

هەردولا رەئیان وا بو لە بەر هەلومەرجی ناسکی عیراق بە هاوبەشی بچنە هەڵبژاردنەوە.

هەندێ لە نوێنەرانی یەکێتی، بە تایبەتی عەدنان موفتی، رەئیان وا بو بۆ هەر سێ هەڵبژاردن پێکەوە بن.

ئەوانەی پارتی، بە تایبەتی مەسعود، رەئیان وابو کە بۆ هەڵبژاردنەکانی ئەنجومەنی نوێنەرانی عیراق و ئەنجومەنی نیشتمانیی کوردستان، پارتی و یەکێتی پێکەوە بن و حیزبەکانی تریش بەشدار بکرێن، بەڵام بۆ هەڵبژاردنی ئەنجومەنی پارێزگاکان هەرلایەک بە تەنیا بێ. بۆ ئەوەی فرسەتێ بدرێ بە خەڵک لە یەکێکیاندا بە ئازادی رای خۆی دەرببڕێ و بۆ ئەوەی هەر لایەک لە خۆی تێ بگا هێزی چەندە.

بڕیار درا کۆمیتەی هاوبەش بۆ هەردو هەڵبژاردن پێک بهێنرێ و هەردو لا توانای خۆیان بۆ بە دەسهێنانی زۆرترین دەنگ تەرخان بکەن.

**6 ی 1 ی 2005:**
دوکان، کۆبونەوەی م س بە سەرپەرشتی تاڵەبانی.
بابەت: تەرخان کرا بۆ باسی هەڵبژاردن.
بۆ گێڕانەوەی هەواڵەکە بڕوانە: کوردستانی نوێ، ژ **3566** ی **2005/1/7**.

**10 ی 1 ی 2005:**
تاڵەبانی چو بۆ بەغداد بۆ بەشداری لە کۆبونەوەی ئەنجومەنی نیشتمانیی عیراق.
بۆ گێڕانەوەی هەواڵەکە بڕوانە: کوردستانی نوێ، ژ **3569** ی **2005/1/11**.

**22 ی 1 ی 2005:**
قەڵاچوالان، سەفیر نیگرۆپۆنتی سەردانی تاڵەبانی کرد. نیگرۆپۆنتی دیپلۆماتێکی ئەمەریکی ناسراوە بەوەی رۆڵی کاریگەری هەبوە لە هەندێ لە کودەتاکانی ئەمەریکای لاتینی دا.
بۆ گێڕانەوەی هەواڵەکە بڕوانە: کوردستانی نوێ، ژ **3577** ی **2005/1/23**.

**23 ی 1 ی 2005:**
سلێمانی، کۆبونەوەی م س بە سەرپەرشتی تاڵەبانی.
تەرخان کرا بۆ باسی هەڵبژاردن.
بۆ گێڕانەوەی هەواڵەکە بڕوانە: کوردستانی نوێ، ژ **3578** ی **2005/1/24**.

**30 ی 1 ی 2005:**
هەڵبژاردن لە سەرانسەری عیراق و کوردستاندا ئەنجام درا.
لە عیراق بۆ ئەنجومەنی نیشتمانی و ئەنجومەنی پارێزگاکان.
لە کوردستان جگە لەو دو ئەنجومەنە بۆ ئەنجومەنی نیشتمانیی کوردستان.
بۆ گێڕانەوەی هەواڵەکە بڕوانە: کوردستانی نوێ، ژ **3584** ی **2005/1/31**.

**1 ی 2 ی 2005:**
مەسعود بارزانی بە بۆنەی هەڵبژاردنەکانەوە نامەیەکی بۆ تاڵەبانی نوسیوە لە نامەکەیدا باسی تەزویری زۆر ئەکا. لەو تەزویرە مەبەستی ئەو دەنگە زیادەیە کە یەکێتی لە هەڵبژاردنی ئەنجومەنی پارێزگاکاندا هێناویێتی.
بەر لە هەڵبژاردن هەندێ لە ئەندامانی م س یەکێتی رەئیان وا بو:

یەکێتی و پارتی بۆ هەر 3 هەڵبژاردن لیستی هاوبەش دروست بکەن. بەڵام بارزانی پێی باش بو بۆ بۆ هەڵبژاردنی ئەنجومەنی نیشتمانی کوردستان و بۆ ئەنجومەنی نوێنەرانی عیراق و ئەنجومەنی پارێزگای کەرکوک و موسل و دیاله لیستی هاوبەش دروست بکرێ، بەڵام له سلێمانی و هەولێر و دهۆک، بۆ ئەوەی خەڵک جۆرێ له ئازادی هەبێ و هەر لایەک له هێزی خۆی تێ بگا بزانێ چەندە، بۆ هەڵبژاردنی ئەنجومەنی پارێزگاکان هەر لایەک بە جیا بەشدار بێ.

یەکێتی بە جیا بەشدار بو. بەڵام پارتی له گەڵ حیزبی شیوعی و حیزبەکانی تورکمان و ئاسوری لیستی هاوبەشی دروست کرد. له گەڵ ئەوەشدا یەکێتی بە تەنیا بەرەوژوری 20 هەزار دەنگی زۆرتری هێنا له پارتی و هاوپەیمانەکانی. مەسعود ئەمەی بە تەزویر ژمارد.

کۆمیسیۆنی باڵای هەڵبژاردنەکان له بەغداد بە هۆی تەزویرەوە هەندێ له سنوقەکانی قەزای سۆرانی فت کردوە. بارزانی نامەی ناڕەزایی بۆ حسێن هنداوی سەرۆکی کۆمیسیۆن نوسیوە و سەرۆکی کۆمیسیۆن وەڵامی داوەتەوە.

2 ی 2 ی 2005:

قەڵاچوالان، دانیشتنی هاوبەش:

له پارتی، وشیار زێباری و د رۆژ شاوەیس نامەی مەسعود بارزانییان هێناوە بۆ تاڵەبانی.

له یەکێتی، د فوئادمەعسوم، د بەرهەم ساڵح، عومەر فەتاح، د لەتیف رەشید له گەڵیان دانیشتون.

کۆبونەوەی م س بە سەرپەرشتی تاڵەبانی بۆ لێکۆڵینەوەی ئەنجامی هەڵبژاردنەکان.

**دەقی نامەکەی مەسعود بارزانی بۆ جەلال تاڵەبانی:**

پارتی دیموکراتی کوردستان

سەرۆک

برای بەریزمان جەنابی مام جلال

سڵاوێکی گەرم

بەهیوای خۆشیتانم و داوای تەندروستی و سەرکەوتنتان بۆ دەکەم.

دوای ئەنجامدانی هەرسێ هەلبژاردن له رۆژی 1/30 بەشیوەیەکی گشتی پێمان وایە پرۆسەکە زۆر باش بوو و کۆتایی هینان بوو بە سیستەمی دیکتاتۆری له عیراق و دانانی بناغەی دامەزراندنی عیراقەکی تازەیە، عیراقی فیدرالی دیموکراتی فرە حیزبی. جاریکی تریش گەلی کوردستان ئیسپاتی کرد کە دیموکراتخوازە .

بۆ باسکردنی ئەنجامەکانی هەلبژاردن و هەنگاوەکانی داهاتوومان وەک بە بروسکەش ئاگاداری جەنابتم کرد پیم باشبوو هەڤالان د. رۆژ و هشیار بینە خزمەتتان بۆ ئەو مەبەستە. هیوادارم رەئی و بۆچونەکانی جەنابتان بزانین.

لەم دەرفەتە دەمەوی چەند تیبینیەکی خۆم عەرزتان بکەم.

1. بە شیوەیەکی گشتی هەلبژاردنەکە سەرکەوتن بوو بۆ گەلەکەمان و شکستیکی گەورە بوو بۆ تیرۆریستان و دکتاتۆرەکان.

2. بەشداریکردنی گەرمی گەلی کوردستان نیشانەیەکی تری زۆر ایجابی بوو.

3. زۆر چاکمان کرد بۆ لیستی پەرلەمانی عیراق و پەرلەمانی کوردستان بە لیستی هاوبەش دابەزین.

4. دەبێ ئەو یەک هەڵویستیە و هاوکاریە پەرەی پی بدەین بۆ هەنگاوەکانی داهاتومان.

ئەمانەی سەرەوە خاڵی ئیجابی بوون و ئیستا دێمە سەرخالە سلبیکان بە نسبەت هەلبژاردنی ئەنجومەنی پاریزگا.

1) تا رۆژی هەلبژاردن من نەمدەزانی صندوقەکانی دەنگدان چاودێری بیانی لە سەر نیە.

2) دیسان لە هەندێک شوێن گرژی لە نێوان برادەرانی پارتی و ینک دروست بووە.

3) لەسەر صندوقەکان ڕێگە نەدراوە ئەوانەی نەخوێندەوار بە کەسی خۆیان ڕەئی خۆیان بنووسن بەڵکو کادرەکانی سەر صندوق بە کەیفی خۆیان نووسیویانە و خۆیان و بەختی خۆیان!

4) دیسان هەندێک (جەنەراڵاتی جەنگ) هەوڵیان دا کێشەکان گەورە بکەن و بۆ حزبایەتیەکی تەسک و دەرفەتێکی وا مێژوویی لە دەست کورد بدەن.

5) شکایەتی یەکجار زۆر لەسەر ڕەفتاری برادەرانی ینک پێمان گەیشتووە و بێ گومان ڕەنگە هەمان شکایەت لەسەر پارتیش بەدەست جەنابت گەیشتبن.

6) هەندێک خروقات یەکجار زۆر زەقن و پینە ناکرێن وەک ژمارەی زیادی دەنگ کە بە دەها هەزار زیاترە لەوەی کە تۆمار کراوە و معلوم بووە پێشتر ئەو شوێنە ژمارەی دەنگدەری چەندە.

بۆ ئەوەی ئەم دەرفەتە لە دەست کورد نەچێت و بەهانە نەدەینە دەست خەڵکی تر سبەی طعن لە دەنگی کورد بۆ پەرلەمانی عێراق بدەن. پێم باش نیە ئەوەی پارێزگاکان بکەینە مشکلە بەڵام ناشکرێت ئەو تەزویرە زۆرانەی کراون لە هەرلایەک قبوڵ بکرێن و ئەمانە ببنە ئەساس بۆ ئایندە.

بۆیە پێم باشە لیژنەیەک لێکۆڵینەوە لەو تەزویرانە بکات کە ژمارەی دەنگدەر زیاد کراوەو بۆ ئایندە نەبێتە ئەساس.

تفاصیلی تریش هەیە هەڤاڵان عەرزتان دەکەن.

لەکۆتاییدا ئومێدەوارم جەنابیشت بە شارەزایی خۆت باش بیری لێ بکەیەوە و هەوڵ بدەین ئەنجامەکە هەرچیەک بێت لەبەرژەوەندی کورد و کوردستان تەواو بێ.

لەگەڵ ڕێز و سڵاوی گەرمم

براتان مسعود بارزانی

2005/2/1

بۆ گێڕانەوەی هەواڵەکە بڕوانە: کوردستانی نوێ، ژ 3587 ی 2005/2/3.

پارتی زیرەکانە خاڵە لاوازەکانی یەکێتی و پارلەمانی عیراقی دیاری کردوە و بۆ قازانجی خۆی لە گفتوگۆدا لە گەڵ یەکێتی بە کاری ئەهێنێ.

لە بەغداد پارلەمان چەند لیستی جیاوازی تێدایە، هەر لیستێ لە چەند گروپ و کەسایەتی جیاواز پێک هاتوە. بە بێ سازان ناتوانن لە سەر هیچ شتێ رێک بکەون. هیچ لیستێکیان بە تەنیا ناتوانێ حکومەت پێک بهێنێ، ناتوانێ سەرکۆمار، سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران و سەرۆکی پارلەمان هەڵبژێرێ. دەنگی یەکگرتوی لیستی هاوپەیمانی بۆ هەڵبژاردنی سەرۆکی کۆمار و سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران و سەرۆکی پارلەمان پێویستە.

تاڵەبانی ئەیەوێ ببێتەوە بە سەرکۆمار. یەکێتی بۆ ئەوەی تاڵەبانی ببێتەوە بە سەرۆک ئەبێ دەس لە زۆر مافی خۆی هەڵبگرێ و واز لە زۆر شت بهێنێ بۆ پارتی.

من زیاتر لە 40 ساڵە لە نزیکەوە مام جەلال ئەناسم، لە هیچ قۆناغێکی ژیانیدا نەم دیوە و نەم بیستوە ئەوەندەی ئیستا عاشقی مەنسەبی حکومەتی بێ و، ئامادە بێ قوربانی و رەنجی دەیان ساڵی هاورێکانی، لە نرخی وەرگرتنیدا بدا.

لە ناو عەرەبدا، تەنانەت لە ناو عەرەبی دەرەوەی عیراقیشدا، لە دەزگاکانی راگەیاندندا ئەوترێ کە عیراق وڵاتێکی عەرەبیە و ئەبێ سەرکۆمارەکەی عەرەب بێ.

جەماعەتی موقتەدا کە لە ناو لیستی ئیئتیلافی شیعەدا قورساییان هەیە بێ پێچوپەنا داوا ئەکەن سەرکۆمار عەرەب بێ.

حیزبی دەعوەش کە گروپێکی گرنگی ناو لیستی ئیئتیلافن و لە گەڵ تاڵەبانی ناکۆکن، هەمان قسە ئەکەن.

حیزبی ئیسلامی و جەبهەی حیوار کە دو گرپی بەهێزی ناو جەبهەی تەوافوقی سونەن، ئەوانیش هەمان قسە ئەکەن.

تاڵەبانی بۆ ئەوەی بەو پلەیە بگا پێویستی بەوەیە:

- لیستی هاوپەیمانی یەکگرتو بێ و مەسعود بارزانی بە خورتی بێتە ناو کایەکەوە و، پێ دابگرێ لە سەر ناودێرانی تاڵەبانی بۆ سەرۆکایەتی کۆمار.

- بۆ ئەوەی لیستی هاوپەیمانی لە هەڵوێستەکانیدا یەکگرتو بێ ئەبێ یەکێتی دەستی بڵاو بێ بۆ بەخشینی بەشەکانی خۆی لە پلە و پایەکانی کوردستان و بەغداد بە پارتی.

- ئەبێ عەرەبی عیراق رازی بکرێن.

سەرکردەکانی پارتی بێ ئەوەی لە کۆبونەوەی رەسمی‌دا بە ئاشکرا پێمان بڵێن لابەلا تێیان گەیاندین بۆ ئەوەی مەسعود بارزانی وەکو کاندیدی سەرۆکایەتی کۆمار جەلال تاڵەبانی پێشکەش بکا ئەبێ یەکێتی مەرجەکانیان قبوڵ بکا. پارتی مەرجەکانی خۆیان بۆ وەرگرتنی پۆستەکانی کوردستان و بەغداد کردوە بە یەک گورزە (پاکێج) و پێکەوەیان گرێ داوە:

لە کوردستان - مەسعود بارزانی بۆ ماوەی 4 ساڵ ببێتە سەرۆکی هەرێم.
نێچیروان بارزانی ببێتە سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران.
پاراستنی ئاسایشی هەولێر بە تەنیا بە دەس پارتیەوە بێ.
وەزارەتەکانی دارایی و پێشمەرگەی حکومەتی یەکگرتو بە وان بدرێ.
لە بەغداد - جێگری سەرۆکی وەزیران و وەزیری دەرەوە بۆ ئەوان بێ.
ئەم مەرجانەی پارتی بۆ یەکێتی قورس بو.

تاڵەبانی چەند جارێکە لە چەند کۆبونەوەی م س یەکێتی‌دا ئەڵێ: "لەبەر خاتری من دەس لە هیچ مافێکی یەکێتی هەڵ مەگرن... من رازی نابم لە سەر لاشەی یەکێتی ببم بە سەرکۆمار..." لە هەندێ کۆبونەوەی تایبەتی‌دا قسەی لەمە توندتر ئەکا. پێم وایە ئەو قسانە بۆ تاقی کردنەوەی دەمی ئەندامە ناڕازیەکانی م س ئەکا چونکە هەڵسوکەوتی لەوە ئەچێ ژێر بە ژێر لە گەڵ بارزانی رێک کەوتبێ.

2 ی 2 ی 2005 چوارشەم:

جۆناسان راندال (رۆژنامەوانی ئەمەریکی، نوسەری کتێبی: "دوای ئەم هەمو کلۆڵیە ئینجا چی؟")، کامەران قەرەداخی (نوسەری ستون لە رۆژنامەی "الحیاة" ی لەندەنی)، لەتیفی شێخ جەمالم بینی.
تاڵەبانی لای راندال سەبارەت بە کێشەی ناوخۆی یەکێتی قسەی نەباشی کردوە.

3 ی 2 ی 2005: پێنجشەم

پیرمام، کۆبونەوەی هاوبەشی هەردو م س بە ئامادە بونی مەسعود بارزانی و جەلال تاڵەبانی.
لە پارتی: نێچیروان بارزانی، مەسرور بارزانی، وشیار زێباری، رۆژ شاوەیس، فازیل میرانی، مەسعود ساڵەیی، سەرباز هەورامی، فەلەکەدین کاکەیی، محەمەدی مەلا قادر، د جەرجیس حەسەن، ئازاد بەرواری، عەبدوسەلام بەرواری.
لە یەکێتی: د بەرهەم سالح، د فوئاد مەعسوم، عەدنان موفتی، عوسمانی حاجی مەحمود، عیماد ئەحمەد، ئەرسەلان بایز، عومەری سەید عەلی، عومەر فەتاح، بەندە.

لە سەر بەغداد و کوردستان قسە کرا.

تاڵەبانی سەرکۆماری عیراق بێ.

مەسعود بارزانی سەرۆکی هەرێم بێ، نێچیروان بارزانی سەرۆکی حکومەت بێ، عەدنان موفتی سەرۆکی پارلەمان بێ.

کابینەکەی کوردستان وەکو ئەوەی بەغدادی لێ بکرێت.

وەزارەتەکان یەک بخرێن جگە لە وەزارەتەکانی دارایی، پێشمەرگە، ناوخۆ، داد، کە هەریەکەیان دو وەزیریان بۆ دائەنرێ.

زەمانبەندی یەکخستنەوەی ئەو وەزارەتانەش بکرێ.

ئەم تەرتیباتە ئەبو بۆ ماوەی یەک ساڵ بێ، واتە تا هەڵبژاردنی داهاتو.

مەسعود بارزانی و جەلال تاڵەبانی کۆنفرەنسی رۆژنامەوانیيان بەست. تاڵەبانی هەندێ جار، بە تایبەتی کە ماندو ئەبێ، لە قسەکانیدا لائەدا، ئەمجارە داوای سەرقفڵانەی لە نێچیروان بارزانی کرد بەرامبەر بەوەی ئەکرێ بە سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران.

بۆ گێڕانەوەی هەواڵەکە بڕوانە: کوردستانی نوێ، ژ 3588 ی 2005/2/4.

چەند جارێ لە کۆبونەوە هاوبەشەکانی هەردو م س دا پێشنیارمان کرد:

ئەنجومەنی نیشتمانیی کوردستان، بێ ئەوەی چاوەڕوانی کۆبونەوەی ئەنجومەنی نوێنەرانی عیراق و ئەنجامی گفتوگۆکانی لیستی هاوپەیمانی و لیستەکانی تر بکا، کۆ ببێتەوە دەس بکا بە کار، بەڵام هەمو جار پارتی بیانویەکیان ئەهێنایەوە بۆ دواخستنی.

پارتی لابەلا دایان بە گوێماندا تا لە سەر دابەشکردنی هەمو پۆستەکانی کوردستان و بەغداد رێک نەکەوین رازی نابن کۆبونەوەی پارلەمانی کوردستان بکرێ. پێیان وابو کۆبونەوەی پارلەمانی کوردستان ئەبێتە دەسکەوتێکی سیاسی بۆ یەکێتی بە تایبەتی هێشتا پرۆژەکەی ئەوانمان نەسەلماند بو بۆ سەرۆکایەتی هەرێم.

4 ی 2 ی 2005:

پیرمام، کۆبونەوەی هاوبەش هەردو م س بە ئامادە بونی تاڵەبانی و بارزانی.

لە یەکێتی: عومەری سەید عەلی، عومەر فەتاح، عوسمانی حاجی مەحمود، عیماد ئەحمەد، عادل موراد، ئازاد جندیانی.

لە پارتی: نێچیروان بارزانی، مەسرور بارزانی، فازیل میرانی، زەعیم عەلی، ئازاد بەرواری، عەبدوسەلام بەرواری، مەسعود ساڵەیی، سەرباز هەورامی.

8 ی 2 ی 2005:

کۆبونەوەی م س یەکێتی لە ماڵی بەندە.

دوبارەکردنەوەی بابەتەکانی پێشو.

12 ی 2 ی 2005:
د ئەیاد عەلاوی هات بۆ سلێمانی.

13 ی 2 ی 2005:
لە لایەن کۆمیسیۆنی باڵاوە ئەنجامی هەڵبژاردنەکان ڕاگەیەنرا.
بۆ گێڕانەوەی هەواڵەکە بڕوانە: کوردستانی نوێ، ژ 3596 ی 2005/2/14.

14 ی 2 ی 2005:
بەپێی ئەنجامە ڕەسمییەکانی کۆمسیۆنی باڵای هەڵبژاردنەکان، بۆ هەڵبژاردنی ئەنجومەنی پارێزگاکان ژمارەی دەنگەکانی قەوارە سیاسییەکان بەم شێوەیەیە:
لەپارێزگای سلێمانی لیستی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان کەژمارە (109) بوو زۆرینەی دەنگەکانی بەدەستهێنا کە (485718) دەنگ بوو،
لیستی پارتی دیموکراتی کوردستان (91578) دەنگ و
یەکگرتووی ئیسلامی (75008) و
حزبی سۆشیالیست (7018) و
حزبی زەحمەتکێشان (5430) و
کۆمەڵی ئیسلامی (53088) و
تەجەمموعی کۆماری عیراقی (1774) و
حزبی شیوعی کوردستان (8192) و
پارتی پارێزگارانی کوردستان (935) و
ئەندازیار عەبدوڵڵا عەلی حسێن (576) دەنگیان بەدەستهێناو
کۆی دەنگدەرانیش لەپارێزگاکەدا (731323) کەس بوو، ڕێژەی بەشداریکردنیش (80%) بوو.
لە پارێزگای هەولێریش لیستی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان (244343) دەنگی بەدەستهێناو لیستی دەنگی دیموکراتیی کوردستانیش کە لە (14) حزب و لایەن پێکهاتووەو (پارتی دیموکراتی کوردستان، حزبی شیوعی کوردستان، کۆمەڵەی ڕۆشنبیری کلدان، بزووتنەوەی دیموکراتی تورکمانی لەکوردستان، ئۆجاغی برایەتیی تورکمان، کۆمەڵەی ڕۆشنبیری تورکمان، پارتی نەتەوەی ڕزگاریی تورکمان، کۆمەڵەی لیبرالی تورکمان، پارتی دیموکراتی تورکمانی کوردستان، پارتی برایەتی تورکمان، حزبی یەکێتی تورکمانی عیراقی، حزبی نیشتمانیی دیموکراتی کوردستان، حزبی گەلی تورکمان-عیراق، حزبی شروقی تورکمان-عیراق) (347772) و یەکگرتووی ئیسلامی (22523) و کۆمەڵی ئیسلامی (18781) و بەرەی تورکمانی (2384) و بزووتنەوەی دیموکراتی گەلی کوردستان (1742) و حزبی سۆشیالیست (1437) و حزبی زەحمەتکێشان (4442) و بزووتنەوەی دیموکراسیخوازان (687)و لیستی ڕافیدەین

(2001) و حزبی یەکێتی دیموکراتی کلدان (646) و پارتی پارێزگارانی کوردستان (1236) دەنگیان بەدەستهێناوە.

لە پارێزگای دهۆکیش لیستی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان (35483) و لیستی دەنگی دیموکراتی کوردستان (302133) و یەکگرتووی ئیسلامی (35675) و حزبی یەکێتی دیموکراتی کلدان (1226) و حزبی شیوعی کوردستان (1384) و لیستی رافیدەین (4919) و حزبی سۆشیالیست (2445) دەنگیان بەدەستهێناوە.

کۆی دەنگدەرانیش (383265) کەس بووەو رێژەی بەشداریکردنیش (89%) بووە.

قەڵاچوالان، کۆبونەوەی م س بە سەرپەرشتی تاڵەبانی لە بارەی ئەنجامی هەڵبژاردنەکان و پەیوەندی لە گەڵ پارتی.

بۆ گێڕانەوەی هەواڵەکە بڕوانە: کوردستانی نوێ، ژ 3597 ی 2005/2/15.

20 ی 2 ی 2005:

دوکان، دانی بەیانی کۆبونەوەی هاوبەشی هەردو م س پارتی و یەکێتی.

لە یەکێتی: کۆسرەت، د کەمال فوئاد، عومەر سەید عەلی، عوسمان حاجی مەحمود، مستەفا سەید قادر، ئاسۆ عەلی.

لە پارتی: فازیل میرانی، ئازاد بەرواری، مەسعود ساڵەیی، د جەرجیس حەسەن.

بابەت: یەکگرتنەوەی هەردو حکومەت.

دوکان، دانی ئێوارە کۆبونەوەی م س بە سەرپەرشتی تاڵەبانی.

بۆ گێڕانەوەی هەواڵەکە بڕوانە: کوردستانی نوێ، ژ 3602 ی 2005/2/21.

21 ی 2 ی 2005:

دوکان، کۆبونەوەی م س بە سەرپەرشتی تاڵەبانی.

بۆ گێڕانەوە هەواڵەکە بڕوانە: کوردستانی نوێ، ژ 3603 ی 2005/2/22.

14 ی 3 ی 2005:

پیرمام، کۆبونەوەی هەردو م س

لە یەکێتی: کۆسرەت رەسول، د فوئاد مەعسوم، د بەرهەم سالح، عومەر سەید عەلی، عومەر فەتاح، ئەرسەلان بایز، عیماد ئەحمەد، عەدنان موفتی، جەلال جەوهەر

لە پارتی: نێچیروان بارزانی، مەسرور بارزانی، فازیل میرانی، د رۆژ شاوەیس، وشیار زێباری، ، ئازاد بەرواری، سەرباز هەورامی.

بابەت:

باسی بەغداد و جۆری هاوکاری لیستەکانی هاوپەیمانی و ئیئتیلاف.

تاڵەبانی، ناڕازیە لە قسەکان و جەوی کۆبونەوەکانی م س یەکێتی بە دڵ نیە، چو بۆ بەغداد.

19 ی 3 ی 2005:

تاڵەبانی لە گەڵ فەخری کەریم، کە پێشتر سەرکردەیەکی حیزبی شیوعی بوە و ئیستا سەرۆکی ئەنجومەنی بەڕێوەبردنی دار المدی و راوێژکاری تاڵەبانیە، لە بەغدادەوە چون بۆ پیرمام بۆ سەردان و دڵدانەوەی بارزانی.

26 ی 3 ی 2005:

ژمارەیەکی زۆری خەڵک ئەپرسن ئەم پارلەمانە بۆ کۆ نابێتەوە. هەندێ سایتی کوردی کەوتونەتە رەخنە و هێرش بەڵکو جنێودان بە سەرکردایەتی هەردو حیزب. وتارێکم نوسی ئەمڕۆ لە سایتی "ریفۆرم" دا بڵاوم کردەوە. سایتی ئەلیکترۆنی "ریفۆرم بۆ" ئەودەم لە لایەن بەندەوە دانرا بو.

ئەمە دەقەکەیەتی:

**دواخستنی کۆبونەوەی**

**ئەنجومەنی نیشتمانیی کوردستان و**

**یەکخستنەوەی حکومەتی هەرێم، هەتا کەی؟**

رۆژی 30 ی 1 ی 2005 خەڵکی کوردستان چون بۆ دەنگدان:

دەنگدان بۆ کۆمەڵەی نیشتمانیی کاتیی عیراق،

دەنگدان بۆ ئەنجومەنی نیشتمانیی کوردستان،

دەنگدان بۆ ئەنجومەنی پارێزگاکان.

تا ئیستا هیچ کام لەم دەزگا هەڵبژێردراوانە نەکەوتونەتە کار.

هۆی کۆنەبونەوەی کۆمەڵەی نیشتمانیی عیراق دیارە ئەگەڕێتەوە بۆ ئەو گفتوگۆ سەختەی لە نێوان لیستی هاوپەیمانی یەکگرتو (شیعە) و لیستی هاوپەیمانی کوردستاندا هەیە و، هەردولا چاوەڕوانی ئەنجامی دانوسەندنن.

بەڵام ئەبێ بیانوی دواکەوتنی بەگەڕخستنی ئەنجومەنی نیشتمانیی کوردستان و، ئەنجومەنی پارێزگاکانی هەولێر و سلێمانی و دهۆک چی بێ؟

دەنگدەرانی کوردستان بە پەرۆشەوە چون بۆ دەنگدان، بە هیوا بون بە زویەکی زو پارلەمانی هەڵبژێردراوی کوردستان کۆ ببێتەوە، حکومەتەکانی هەولێر و سلێمانی یەکبخاتەوە، دەوری خۆی بە چالاکی لە دانانی بودجەی هەرێم و جۆری دابەش کردن و سەرف کردنیدا، لە لێپرسینەوەی وەزیرەکانی حکومەتی هەرێمدا، لە ژیانی سیاسی، ئابوری، کۆمەڵایەتی، رۆشنبیری، دانیشتوانی هەرێمدا بگێڕێ...

بەڵام وا دو مانگ تێ پەڕی کەچی هێشتا:

نە پارلەمانی کوردستان کۆبۆتەوە و نە حکومەتەکانی هەولێر و سلێمانی یەک خراونەتەوە و، نە هیچ نیشانەیەکیش بە دی ئەکرێ بۆ ئەنجامدانی ئەو کارانە...

هۆی کۆنەبونەوەی ئەنجومەنی نیشتمانیی کوردستان و یەکنەخستنەوەی حکومەتی هەرێم چیە و، ئۆباڵی دواخستنی لە ئەستۆی کێ دایە؟

هەمو کەس ئەزانێ "لیستی دیمۆکراتی نیشتمانی کوردستان" کە لیستی هاوبەشی یەکێتی و پارتی و یەکگرتوی ئیسلامی و کۆمۆنیست و سۆشیالیست و تورکمان و کلدۆئاشوریە، لە سەر بنچینەی "سازان" کۆ کراوەتەوە، بەڵام زۆرایەتی ئەندامانی لیستەکە کاندیدەکانی یەکێتی و پارتی‌ین و، بڕیاردان لە کۆبونەوەی ئەنجومەنەکەش بە دەس سەرکردایەتی ئەم دو حیزبەیە.

ئاخۆ سەرکردایەتی هەردو حیزب ئەیانەوێ کۆکردنەوەی ئەنجومەنی نیشتمانی کوردستان و یەکخستنەوەی حکومەتی هەرێم دوا بخرێ؟ ئەگەر هەردوکیان ئەیانەوێ دوابخرێ بیانوەکانیان چیە؟ خۆ ئەگەر لایەکیان پێی باشە جارێ دوابخرێ و لایەکیان پێی باشە بەگەڕبخرێ، بیانوەکانیان بۆ دواخستن و بەگەڕخستن چیە؟

دەنگدەرانی کوردستان، مافی ئاسایی خۆیانە بپرسن و بزانن هۆی ئەم دواکەوتنە چیە و هەتا کەی؟ (تەواو)

31 ی 3 ی 2005:

قەڵاچوالان، فازیل میرانی و ئازاد بەرواری هاتن بۆ سەردانی تاڵەبانی. هەرچەند ئەوان قسەی تایبەتی‌یان هەبو، راسپاردەی بارزانییان پێ بو بۆ تاڵەبانی، بەڵام تاڵەبانی داوای لە ئێمەش: کۆسرەت، کەمال فوئاد، عومەری سەید عەلی، بەندە، کرد بچین بۆ ئەوێ بۆ سەردانیان. عەدنان موفتی و فەخری کەریم لەوێ بون.

6 ی 4 ی 2005:

مام جەلال هەڵبژێردرا بە سەرکۆماری "کاتیی" عیراق.

18 ی 4 ی 2005: دوشەم

دوکان، کۆبونەوەی هاوبەشی هەردو م س.

لە یەکێتی: عومەری سەید عەلی، عومەر فەتاح، عوسمان حاجی مەحمود، ئەرسەلان بایز، عیماد ئەحمەد، حەمە تۆفیق، بەندە.

لە پارتی: فازیل میرانی، ئازاد بەرواری، عیزەدین بەرواری، محەمەد مەلا قادر، مەسعود ساڵەیی، کەمال کەرکوکی، مەحمود محەمەد،

بابەتەکان:

1. کۆبونەوەی پارلەمان

بڕیار درا رۆژی 24 ی 04 ی 2005 له رۆژی بۆردومانی قه‌ڵادزێدا کۆ ببێته‌وه.
سه‌رۆکایه‌تی پارله‌مان پێک بێ له: عه‌دنان موفتی سه‌رۆک، که‌مال که‌رکوکی جێگری سه‌رۆک، فرسه‌ت ئه‌حمه‌د سکرتێری ئه‌نجومه‌ن.
2. یه‌کخستنه‌وه‌ی ئیداره
کۆمیته‌یه‌کی هاوبه‌ش 3 که‌س له یه‌کێتی و 3 که‌س له پارتی پێک بێ بۆ:
پێداچونه‌وه‌ی وه‌زاره‌ته‌کان و گونجاندنی کابینه‌که‌ی کوردستان له گه‌ڵ وه‌زاره‌ته‌که‌ی به‌غداد.
دواخستنی یه‌کخستنی وه‌زاره‌ته‌کانی: پێشمه‌رگه‌، ناوخۆ، دارایی، داد، تا رێوشوێنی جۆری تێکه‌ڵاو کردنه‌وه‌یان دائه‌نرێ.
دیاریکردنی وه‌زاره‌ته‌کانی که ئه‌درێن به لایه‌نه‌کانی تر.
دابه‌شکردنی وه‌زاره‌ته‌کان به سه‌ر هه‌ردو لادا.
3. قانونی سه‌رۆکی هه‌رێم
پارتی پرۆژه‌یه‌کیان له گه‌ل خۆیان هێنا بو به ناوی "قانون رئیس اقلیم کوردستان – العراق". یه‌کێتی داوایان کرد ماوه‌یه‌کیان بدرێتێ بۆ لێکۆڵینه‌وه‌ی.
4. ئه‌نجومه‌نی پارێزگای که‌رکوک

له‌م ماوه‌یه‌دا تاڵه‌بانی، د فوئاد مه‌عسوم، د به‌رهه‌م سالح، له به‌غداد بون و، له ئه‌ندامانی م س ئه‌مانه له ده‌ره‌وه‌ی عیراق بون: کۆسره‌ت ره‌سول، د که‌مال فوئاد، مه‌لا به‌ختیار، مسته‌فا سه‌ید قادر.
بۆ گێڕانه‌وه‌ی هه‌واڵی کۆبونه‌وه‌که بڕوانه: کوردستانی نوێ، ژماره‌ی 3649 رۆژی 19 ی 4 ی 2005.

20 ی 4 ی 2005:
کۆبونه‌وه‌ی م س بۆ لێدوان له بابه‌ته‌کانی پێشو.

21 ی 4 ی 2005: پێنجشه‌م
پیرمام، کۆبونه‌وه‌ی هاوبه‌شی هه‌ردو م س به سه‌رپه‌رشتی مه‌سعود بارزانی.
له یه‌کێتی: عومه‌ر سه‌ید عه‌لی، ئه‌رسه‌لان بایز، عومه‌ر فه‌تاح، عوسمانی حاجی مه‌حمود، حه‌مه تۆفیق، عه‌دنان موفتی، به‌نده.
له پارتی: فازیل میرانی، ئازاد به‌رواری، عیزه‌دین به‌رواری، محه‌مه‌دی مه‌لا قادر، مه‌حمود محه‌مه‌د، که‌مال که‌رکوکی، مه‌سعود ساڵه‌یی.
ئێمه قانونی سه‌رۆک مان به ته‌عدیل کراوی له گه‌ڵ خۆمان برد بو به ته‌ما بوین باسی بکه‌ین له به‌ر ئه‌وه‌ی له دوای ده‌سپێکردنی کۆبونه‌وه‌که مه‌سعود بارزانی و

مەسرور هاتن بۆیە بە باشمان نەزانی بە بەرچاوی بارزانیەوە باسی قانونی سەرۆک بکەین، چونکە پێوەندی بە خودی خۆیەوە هەبو، قانونەکەیان بە باڵای ئەو بڕی بو.

باسی یەکخستنەوەی هەردو ئیدارە کرا و، پێشنیار کرا 3 لە یەکێتی و 3 لە پارتی دیاری بکرێن بۆ باسی یەکخستنەوەی وەزارەتەکان و، بۆ یەکخستنەوەی وەزارەتی داد بڕیار درا: کۆمیتەیەک پێک بێ لە دارا نورەدین، مونزیر فەزل، نوری تاڵەبانی، هەردو سەرۆکی مەحکەمەی تەمییزی سلێمانی و هەولێر و، سەرۆکەکانی مەحکەمەی ئیستینافی سلێمانی، هەولێر و دهۆک. ئەمانە سەرلەنوێ چاو بە دەزگای قەزاییدا بخشێننەوە و دایبمەزرێننەوە.

کۆبونەوەی ئەنجومەنی نیشتمانیی کوردستان، بە بیانوی ئەوەی ئامادەیی تەواوی بۆ نەکراوە، دواخرا بۆ 30 ی مانگ.

بۆ گێڕانەوەی هەواڵی کۆبونەوەکە بڕوانە: کوردستانی نوێ، ژمارەی 3653 رۆژی 24 ی 4 ی 2005.

28 ی 4 ی 2005، پێنجشەم:

دوکان، کۆبونەوەی هاوبەشی هەردو م س.

لە یەکێتی: عومەر سەید عەلی، ئەرسەلان بایز، عومەر فەتاح، عوسمانی حاجی مەحمود، حەمە تۆفیق، بەندە.

لە پارتی: فازیل میرانی، ئازاد بەرواری، عیزەدین بەرواری، محەمەد مەلا قادر، مەحمود محەمەد، کەمال کەرکوکی، مەسعود ساڵەیی

پارتی پێشنیاریان کردبو هەر لایەک دو قانونی ببەن ئێمە حاکم شێخ لەتیف و حسێن عارف مان برد بو، ئەوان کەسیان نەهێنابو.

پارتی لە سەر دەسکارییەکانی یەکێتی رازی نەبون. سور بون لە سەر ئەوەی:

سەرۆکایەتی بۆ 4 ساڵ بێ. بە هەڵبژاردنی راستەوخۆ بێ. بە رێژەی زۆرینە بێ. جێگری نەبێ. فەرماندەی گشتی هێزە چەکدارەکان بێ. سەرۆکی ئەنجومەنی ئاسایش بێ....

نەگەیشتینە یەک لە بەر ئەوە:

کۆبونەوەی ئەنجومەنی نیشتمانیی کوردستان و، کۆبونەوەی ئەو کۆمیتەیەی دانرا بو بۆ باسی یەکخستنەوەی هەردو ئیدارە، دواخرا بۆ کاتێکی دیاری نەکراو.

بۆ گێڕانەوەی هەواڵەکە بڕوانە: کوردستانی نوێ، ژمارەی 3658 رۆژی 29 ی 4 ی 2004.

30 ی 4 ی 2005:

ئەبو ئەمڕۆ یەکەم کۆبونەوەی خولی دوەمی ئەنجومەنی نیشتمانیی کوردستان دەس پێ بکا. هەندێ میوانی کورد و بێگانە هاتبون بەشداری ئاهەنگی کردنەوەی بن. پارتی کۆبونەوەکەی دوا خست.

فازیل میرانی لە گەل میوانەکان دانیشتوە بۆ پاساودانی هۆی دواخستنی کۆبونەوەکە هەندێ قسەی بۆ کردون. تەلەڤزیۆنی پارتی، کوردستان تی ڤی، هەواڵەکەی بەمجۆرە بڵاو کردۆتەوە:

پاش نیوەڕۆی ئەمڕۆ لە بارەگای م س – پ د ک لە سەلاحەدین فازیل میرانی سکرتێری م س – پ د ک لە گەڵ ژمارەیەک لەو میوانانەی ناوەوە و دەرەوەی کوردستان کۆ بوەوە کە بڕیار بو لە دانیشتنە چاوەڕوانکراوەکەی پەرلەمانی کوردستان دا بەشدار بن. لە کۆبونەوەکەدا سکرتێری م س – پ د ک پانۆرامەیەکی ورد و چڕی لە بارەی ڕێککەوتنی نێوان پ د ک و ی ن ک و لایەنە سیاسیەکانی نێو هاوپەیمانی کوردستانی بۆ دەست نیشان کردن.... تادوایی.

3 ی 5 ی 2005:

تاڵەبانی لە بەغدادەوە ئەم بروسکەیەی ناردوە:

لە هەڤاڵان مام جەلال، د فوئاد، د بەرهەم

بۆ هەڤاڵانی م س بەڕێز

ژ: 65

رۆژ: 4/3 ی 5 ی 2005

سڵاوێکی گەرم

1. ئەو پێشنیارەی ڕێکەوتنی ی ن ک و پ د ک دوای گۆڕانکاریەکان بە لای ئێمەوە پەسەندە بە تایبەتی تەوازونێکی باشی تێدایە. هیواداریین ئێوەش بە دڵتان بێت.

2. پێمان باشە کاک کۆسرەت و د بەرهەم بنێرن بۆ یەکالا کردنەوەی لە گەڵ برایانی پارتی.

لە گەڵ ڕێزماندا

4 ی 5 ی 2005:

وتارێکم نوسی ئەمڕۆ لە سایتی "ریفۆرم" دا بڵاوم کردەوە.

ئەمە دەقەکەیەتی:

**لە کاتێکدا**

**عیراق بۆ پێشەوە ئەچێ،**

**کوردستان ئەگەڕێتەوە بۆ دواوە!**

له ژێر گوشاری ڕوداوەکانی عیراقدا سەرکردایەتی هەردو حیزب: یەکێتی نیشتمانی کوردستان و پارتی دیمۆکراتی کوردستان پێک هاتن له سەر ئەوەی لیستی هاوبەش بۆ هەڵبژاردنی کۆمەڵەی نیشتمانیی عیراق و ئەنجومەنی نیشتمانیی کوردستان ئامادە بکەن و پێکەوە بەشداری هەڵبژاردن بین.

هەروەها پێک هاتن له سەر ئەوەی کە ئەگەر لیستی کوردستانی له بەغداد توانی پۆستێکی سەروەری (سەرۆکی کۆمار یا سەرۆکی وەزیرانی عیراق) بە دەس بهێنێ، ئەوا تاڵەبانی بۆ ناودێر بکرێ و له بەرامبەر ئەوەدا له کوردستان بۆ پۆستی سەرۆکی هەرێم بارزانی ناودێر بکرێ. ئەگەر له بەغداد کورد نەیتوانی ئەو پۆستە وەر بگرێ، له کوردستانیش ئەو پۆستە دانانرێ.

هەروەها پێک هاتن کە ئەمجارە سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیرانی هەرێمی کوردستان بۆ پارتی و جێگرەکەی له یەکێتی بێ و، سەرۆکایەتی ئەنجومەنی نیشتمانیی کوردستان بۆ یەکێتی و جێگرەکەی له پارتی بێ.

بە پێی مادەی 40 ی ئەو پرۆژەیەی کە ئەنجومەنی نیشتمانیی کوردستان بۆ دەستوری هەرێمی کوردستان له 31 ی 12 ی 2002 دا پاش تاووتوێ کردنێکی زۆر ئامادەی کردوە، سەرۆکی هەرێمی کوردستان ئەبێ بە هەمان ڕێگە هەڵبیژێردرێ کە له عیراق هەڵئەبژێردرێ.

بۆ ئەوەی هەمو کەس ئاگادار بن له جیاوازییەکانی بیروبۆچونی سەرکردایەتی هەردو حیزب دەبارەی:

1. دەسەڵاتەکانی سەرۆکی هەرێم
2. ماوەی سەرۆکایەتی هەرێم
3. جۆری هەڵبژاردنی سەرۆکی هەرێم

وا لێرەدا 3 بەڵگە بڵاو ئەکەینەوە:

یەکەمیان، ئەو پرۆژەیەیە کە ئەنجومەنی نیشتمانیی کوردستان ساڵی 2002 دایناوە.

دوەمیان، پرۆژەی "قانون رئاسە اقلیم کوردستان – العراق" کە سەرکردایەتی پارتی ئامادەی کردوە و لەمڕۆژانەدا داوێتی بە سەرکردایەتی یەکێتی بۆ پەسندکردنی تا ببرێتە بەردەم پارلەمان و، له یەکەمین یا له دوەمین کۆبونەوەیدا دەنگی موافەقەتی له سەر بدا.

سەرکردایەتی پارتی، له سێ مانگی ڕابوردودا بە بیانوی پەلە نەکردنەوە ڕازی نەئەبو کۆبونەوەی پارلەمانی کوردستان بکرێ. ئیستاش کۆبونەوەی ئەنجومەنی نیشتمانیی کوردستان و، یەکخستنەوەی هەردو ئیدارە و، کاروبارەکانی عیراقی بەستوە بە پەسند کردنی ئەم قانونەوە. هەر بۆیە دو جار کۆبونەوەی ئەنجومەنی نیشتمانیی کوردستانی جاری یەکەم له 24 ی 4 و جاری دوەم له 30 ی 4 ی 2005 دا دوا خست و، تا ئەم کێشەیە بە لایەکدا نەکەوێ، ناهێڵن پارلەمان کۆ ببێتەوە.

سێیەمیان، ئەو پرۆژەیەیە کە لە لایەن سەرکردایەتی یەکێتی‌یەوە چاکسازی کراوە.
ئێمە ئەمڕۆ بەڵگەکان بڵاو ئەکەینەوە بۆ خوێندەواری کورد خۆی بۆچونێکی لە لا گەڵاڵە بێ و، دواتر دێینەوە سەر شیکردنەوەیان.(تەواو)

5 ی 5 ی 2005:
وتارێکی ترم نوسی ئەمڕۆ لە سایتی "ریفۆرم" دا بڵاوم کردەوە.

ئەمە دەقەکەیەتی:
**لە نرخی سەرۆکایەتی کۆماری عیراقدا**
**یەکێتی چی داوە بە پارتی؟**
کاربەدەستانی پارتی باس لەوە ئەکەن کە یەکێتی، پاش ئەوەی بەڕێز تاڵەبانی پۆستی سەرۆکایەتی عیراقی وەرگرت، بە مەبەستی خۆی گەیشت و، لە بەشی دوەمی رێکەوتنەکەیان پەشیمان بونەتەوە کە هەڵبژاردنی پۆستی سەرۆکایەتی هەرێمی کوردستانە بۆ بەڕێز بارزانی.
بێگومان ئەمە راست نیە. یەکێتی پەشیمان نەبۆتەوە. پابەندی رێککەوتنەکەیە و، سورە لە سەر جێبەجێ کردنی، بەڵام لە سەر 3 کێشە ناکۆکن کە هێشتا بەلادا نەکەوتون، کێشەکان بریتین لە:

یەکەم، ماوەی "ولایەتی" سەرۆکایەتی هەرێم.
یەکێتی پێی وایە: لە گەڵ تەواو بونی ولایەتی سەرۆکایەتی کۆماری عیراقدا ولایەتی سەرۆکایەتی هەرێمیش تەواو ئەبێ، چونکە لە مانگی 12 ی 2005 دا ئەبێ سەر لە نوێ هەڵبژاردنەکانی کۆمەڵەی نیشتمانیی عیراق و ئەنجومەنی نیشتمانیی کوردستان دوبارە بێتەوە.
پارتی پێی وایە: ئەبێ ماوەی ولایەتی سەرۆکایەتی هەرێم نەبەسترێ بە هەڵبژاردنەکانی عیراق و کوردستانەوە، ئیستا بۆ 4 ساڵ هەڵبژێردرێ و دو جاری تریش قابیلی هەڵبژاردنەوە بێ.

دوەم، جۆری هەڵبژاردنی سەرۆکی هەرێم.
یەکێتی پێی وایە: ئەبێ وەکو هەڵبژاردنی سەرۆکایەتی بێ لە عیراق، لە لایەن ئەندامانی کۆمەڵەی نیشتمانی‌یەوە بە دەنگی دوسێیەک هەڵبژێردرێ.
پارتی پێی وایە: ئەبێ بە دەنگدانی گشتی راستەوخۆ و نهێنی دەنگدەرانی کوردستان و بە زۆرایەتی‌یەکی سادە بێ.

سێیەم، دەسەڵاتەکانی سەرۆکی هەرێم.

یەکێتی پێی وایە: ئەبێ لە چوارچێوەی جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکانی تەنفیزی و تەشریعی و قەزائیدا دیاری بکرێ نەک لە سەرو ئەوانەوە بێ.

پارتی پێی وایە: ئەبێ هەمەلایەنە و گشتگیر بێ.

دوای چارەسەر کردنی ئەم ناکۆکیانە کە ئەبێ لە قانونی سەرۆکایەتی هەرێمی کوردستاندا رەنگ بداتەوە، پۆست سەرۆکایەتی هەرێم پڕ ئەکرێتەوە.

یەکێتی لە نرخی ئەوەدا کە پۆستی سەرۆکایەتی کۆماری لە بەغداد وەرگرتوە، ئەم پۆستانەی داوە بە پارتی:

لە بەغداد:

جێگری سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران،

جێگری سەرۆکی کۆمەڵەی نیشتمانیی عیراق،

وەزیری کاروباری دەرەوە، کە تەنیاپایەی سەروەرییە لە وەزارەتەکانی عیراقدا بەر کورد کەوتوە،

وەزیری شارەوانی،

وەزیری کار و کاروباری کۆمەڵایەتی.

لە کوردستان:

سەرۆکی هەرێمی کوردستان،

سەرۆکی ئەنجومەنی یەکگرتوی هەرێمی کوردستان.

با خەڵکی کوردستان خۆیان حاکم بن، وەکو حیزب، کێ قازانجی زۆرتری بردوە؟

(تەواو)

6 ی 5 ی 2005:

وتارێکی ترم نوسی ئەمڕۆ لە سایتی "ریفۆرم" دا بڵاوم کردەوە.

ئەمە دەقەکەیەتی:

**لێدوانێ لە پرۆژەکەی پارتی بۆ**

**قانونی سەرۆکایەتی هەرێمی کوردستان**

پرۆژەکەی پارتی کە لە ژێر ناوی "قانون رقم (  ) لسنه 2005 – قانون رئاسه اقلیم کوردستان - العراق" بە زمانی عەرەبی نوسراوە، بە گشتی 18 مادەیە، دابەش کراوە بە سەر 5 بەشدا:

بەشی یەکەمی بۆ ئەحکامی گشتی،

بەشی دوەمی بۆ مەرجەکانی پاڵێوراو و دەنگدەران،

بەشی سێیەمی بۆ پاڵاوتن و دەنگدان،

بەشی چوارەمی بۆ ئەرکەکان و دەسەڵاتەکانی سەرۆکی هەرێم،

بەشی پێنجەمی بۆ ئەحکامی گوێزانەوە، تەرخان کراوە.

لێرەدا بۆ ئەوەی هاوولاتی کوردی لە ناو وردەکاریدا چەواشە نەبێ، بە ریز لە یەکەمین مادەی قانونەوە ناچینە خوارێ، چونکە مادەکان و بابەتەکان تێکەلاو کراون، بەلکو هەولٚ ئەدەین بۆ ئەوەی وێنەیەکی رون لە لای خوێندەوار هەبێ، ناوەرۆکی هەمو قانونەکە لە چەند لایەکی سەرەکیەوە تاووتوێ بکەین.

یەکەم، دەسەلاتەکانی سەرۆکی هەرێم

مادەکانی 1 و 2 و 10 و 13 ی قانونەکە تەرخان کراون بۆ دەسەلاتەکانی سەرۆکی هەرێم:

بە پێی مادەی 1 سەرۆکی هەرێم سەرۆکی بالای دەسەلاتی کارگێڕیە لە هەرێمدا.

بە پێی مادەی 2 سەرۆکی هەرێم نوێنەری هاوولاتیانی کوردستانە و وتەبێژی ئەوانە لە ناوە و دەرەوەی هەرێم و، هاوئاهەنگیکاری نێوان دەسەلاتەکانی بەغداد و دەسەلاتەکانی هەرێمی کوردستانە.

مادەی 10 بریتیە لە 16 بڕگەی جۆراوجور:

بڕگەی 1 مەرسوم دەر ئەکا بۆ دەرکردنی ئەو قانونانەی ئەنجومەنی نیشتمانی کوردستان دایان ئەنێ.

بڕگەی 2 مەرسوم دەر ئەکا بۆ هەلٚبژاردنی ئەنجومەنی نیشتمانی کوردستان لە کاتی هەلوەشاندنەوە و تەواو بونی ماوەکەیدا.

بڕگەی 3 مەرسوم دەر ئەکا بۆ بانگکردنی ئەنجومەنی نیشتمانی بۆ کۆبونەوە.

لەم 3 بڕگەیەدا کات گرنگە لەبەر ئەوە:

یەکەم، بڕگەی 1 بەوە چارەسەر کراوە ئەگەر سەرۆک تا 10 ڕۆژ قانونەکەی نەپەسەند، بێ پەسەندنی ئەویش ئەبێتە قانون.

دوەم، بڕگەی 2 و 3 کاتەکەی بە دیاری نەکراوی ماوەتەوە بۆیە پێویستە بۆ ئەوانیش کاتی هەلٚبژاردنەوە و کۆبونەوەی ئەنجومەن دیاری بکرێت، تا ئەگەر سەرۆک، لە بەر هەر هۆیەک بێ، نەی ویست هەلٚبژاردنەوە ئەنجام بدرێ یا ئەنجومەن کۆببێتەوە، کارەکە لە ماوەیەکی دیاریکراودا بە قانونی بڕوا.

بڕگەی 4 مەرسوم دەر ئەکا بۆ هەلوەشاندنەوەی ئەنجومەنی نیشتمانیی کوردستان لە چەند حالەتێکی دیاریکراودا.

بڕگەی 5 لە هەندێ حالەتی دیایکراودا بڕیار دەر ئەکات کە هێزی قانونیان هەیە.

بڕگەی 6 لێبوردنی تایبەتی بۆ حوکمدراوان.

بڕگەی 7 پەسەندنی حوکمی ئیعدام و یا سوککردنی بە زیندانیی درێژ.

بڕگەی 8 راگەیاندنی باری نائاسایی.

بڕگەی 9 دیوانی چاودێری دارایی بە سەرۆکی هەرێمەوە ئەبەسترێتەوە.

کاری دیوانی چاودێری دارایی ئەوەیە کە چاودێری داهات و دەرچوی دەسەلاتی کارگێڕی و بەڕێوەبەرایەتی حکومەت و داوودەزگاکانی تر بکا، لە بەر ئەوە لە هەمو

وڵاتانی دیموکراتی‌دا بۆ ئەوەی بەر لە دەستێوەردان بگیرێ و، بتوانرێ گەندەڵی دارایی و بەڕێوەبەرایەتی ئاشکرا بکرێ و، بە رۆشنی بخرێتە بەردەم رای گشتی، دیوانی چاودێری دارایی دەزگایەکی سەربەخۆیە لە هەمو دەزگاکان و، پارلەمان سەرۆک و ئەندامەکانی هەڵئەبژێرێ.

بۆیە ئەم بڕگەیە لەم قانونەدا جێی نابێتەوە.

بڕگەی 10 هێنانی هێزی چەکداری فیدرالی بۆ ناو هەرێم، لە کاتی پێویستدا، بە رەزامەندی ئەنجومەنی هەرێم.

ئەم بڕگەیە پێویستی بە وردکردنەوەی زۆرتر و دانانی مەرجی زیاتر هەیە، چونکە ئەشێ خراپ بە کار بهێنرێ.

بڕگەی 11 و 12 مەرسوم دەر ئەکا سەبارەت بە وازهێنان و دانانەوەی وەزیرەکان.

بڕگەی 13 دامەزراندنی کارمەندانی پلەی تایبەت و حاکم و سەرۆک و ئەندامانی ئیدیعای گشتی.

ئەم بڕگەیە دو لای جیاوازی تێکەڵاو کردوە، کارمەندانی پلەی تایبەتی و دەزگای قەزایی:

یەکەمیان، کارمەندانی پلەی تایبەت ئەبێ لە لایەن وەزارەتەکانەوە ناودێر بکرێن، ئەوسا ئەنجومەنی نیشتمانی یان ئەنجومەنی وەزیران موافەقەتیان لە سەر بکا، ئینجا سەرۆکی هەرێم فەرمانی دامەزراندنیان دەربکا.

دوەمیان، دەزگای قەزایی پێویستە سەربەخۆ بێ لە دەسەڵاتی کارگێڕی، ئەگینا ئەگەر سەرۆکی هەرێم ئەندامانی ئەنجومەنی قەزا و ئیدیعای عام و حاکمەکان دابمەزرێنێ، سەربەخۆیی دەسەڵاتی قەزایی چ مانایەکی ئەبێ؟

ئەنجومەنی قەزا و ئەندامانی ئیدیعای گشتی ئەبێ سەربەخۆ بن و، لە لایەن ئەنجومەنی نیشتمانی‌یەوە هەڵبژێردرێن و، حاکمەکان ئەنجومەنی قەزا هەڵیانبژێرێ، ئینجا سەرۆکی هەرێم فەرمانی دامەزراندنیان دەر بکا.

بڕگەی 14 و 15 لێرەدا جێیان نابێتەوە ئەبێ لە گەڵ مادەی 13 باس بکرێن.

بڕگەی 16 سەرۆکایەتی ئەنجومەنی باڵای ئاسایشی هەرێم ئەکا.

هەبونی دەزگایەکی لەو بابەتە بۆ هەرێمی کوردستان شتێکی پێویستە بۆ ئەوەی چوارچێوەی ستراتیجی ئاسایشی نیشتمانیی هەرێمی کوردستان دابڕێژێ. بەڵام:

یەکەم،

ئەندامانی ئەم ئەنجومەنە کێ ئەبن، کام لە وەزیرەکان ئەندامی ئەبن؟

دوەم،

ئاخۆ هەتا هەردو ئیدارە یەکنەگرنەوە، لەوەش گرنگتر هەردو وەزارەتەکانی پێشمەرگە و ناوخۆ و دارایی، هەردو هێزی پێشمەرگەی یەکێتی و پارتی و، هەردو

دەزگای ئاسایش و، هەروەها دەزگای زانیاری و ڕێکخستنی تایبەت، یەکنەگرنەوە دامەزراندنی ئەنجومەنێکی لەو بابەتە لە توانادایە؟

سێیەم،

دەسەڵاتی ئەم ئەنجومەنە چی ئەبێ و، دەسەڵاتەکانی سەرۆک لەم ئەنجومەنەدا چیە؟

مادەی 13 سەرۆک فەرماندەی گشتی هێزە چەکدارە (دیفاعی) یەکانی هەرێمی کوردستانە.

بێگومان هەمو کوردێ بەوە دڵشاد ئەبێ کوردستان فەرماندەی گشتی هێزە چەکدارەکانی هەبێ و، پێشمەرگەش ببێتە هێزێکی نیزامیی هاوچەرخی پاراستنی کوردستان لە هەڕەشەکانی ئێستا و پاشەڕۆژ، بەڵام لێرەدا چەند کێشەیەکی راستەقینە دێنە پێشەوە:

یەکەم،

مەبەست لە هێزە چەکدارە (دیفاعی) یەکانی هەرێم کام هێزانەیە؟

ئەگەر مەبەست هێزەکانی پێشمەرگەیە، ئەوا ئەو هێزانە هەر یەکەیان سەر بە حیزبەکانی خۆیانن، دڵسۆزییان لە پیش هەمو شتێکەوە بۆ حیزبەکانی خۆیان و سەرکردەی حیزبەکانی خۆیانە، بە فەرمانی ئەوان و لە چوارچێوەی سیاسەتی حیزبەکانیاندا کار ئەکەن.

تا ئێستاش گەورەترین مەترسی خەڵک لە هەلگیرسانەوەی شەڕی ناوخۆ بونی ئەم هێزانەیە بەو جۆرەی کە هەبون.

دوەم،

تا ئێستا هێزەکانی پێشمەرگە لەلایەن حکومەتی عیراق و وەزارەتی دیفاعی عیراق و، لە لایەن ئەمەریکا و هێزەکانی فرەڕەگەزەوە بە رەسمی نەناسراون. ئەم هێزانە بە میلیشیای حیزبی ناو ئەبەن. رەنگە هۆیەکی ئەمەش بگەڕێتەوە بۆ یەکنەگرتنەوەیان لە سپایەکی یەکگرتوی حکومەتیدا.

سێیەم،

ئەگەر مەبەست لە هێزە چەکدارە (دیفاعی) یەکانی هەرێم، هێزەکانی ئاسایشی ناوخۆیە کە سەر بە وەزارەتی ناوخۆن ئەوا ئەویش سەر بە دو وەزارەتی ناوخۆی جیاوازن کە حیزبایەتی پێوانەی یەکەمی کۆکردنەو دامەزراندنیان بوە.

چوارەم،

ئەگەرچی کەرتەکانی جەیشی عیراق و پاسەوانی نیشتمانی لە کوردستاندا هەن ئەگەرچی ئەوانیش هەردو حیزبەکە دەوری گرنگیان هەبوە لە کۆکردنەوە و ڕێکخستنیاندا، بەلام ئەوانە بە رەسمی لە ژێر سەرکردایەتی وەزارەتی دیفاعی عیراقی دان و، لەوان فەرمان وەرئەگرن.

پێنجەم،

گریمان هەمو ئەو کێشە و گیروگرفتانەی باس کران چارەسەر کران، هێزەکانی پێشمەرگە و ئاسایشی ناوخۆ یەکخران و، کرانە هێزی حکومەتی هەرێمی کوردستان، ئایا لە هیچ هەرێمێکی فیدرالی دەوڵەتانی دنیادا فەرماندەی گشتی هێزی چەکداری هەرێم هەیە؟

بڕگەی 14 ی مادەی 10 سەبارەت بە بەخشینی پایەوپلەی سەربازی و دەرکردن و خانەنشین کردنی ئەفسەرانی هێزە چەکدارەکان و، بڕگەی 15 ی مادەی 10 دەبارەی بەخشینی نۆت و ویسام، ئەبێ لە گەڵ چارەسەرکردنی ئەم کێشەیەدا باس بکرێن.

کورتی‌یەکەی: هەڵسەنگاندنی دەسەڵاتەکانی سەرۆکی هەرێم لەم پرۆژەیەدا دەری ئەخەن قانونەکە بە جۆرێ داڕێژراوە کە تەنیا بۆ "سیستەمی سیاسی سەرۆکایەتی" بشێ.

دوەم، جۆری هەڵبژاردنی سەرۆکی هەرێم

لە وڵاتانی دیمۆکراتی‌دا بۆ حوکمڕانی دو سیستەمی سیاسی باوە: یەکێکیان سیستەمی پارلەمانی‌یە و، ئەوی تریان سیستەمی سەرۆکایەتی‌یە.

لە سیستەمی پارلەمانی‌دا سەرۆکی وڵات لە ناو پارلەماندا هەڵئەبژێردرێ. هەر پارلەمانیش دەسەڵاتی لێپرسینەوەی سەرۆک و لابردنی هەیە.

پارلەمان باوەڕ ئەبەخشێ بە ئەندامانی ئەنجومەنی وەزیران و لە وەزیرەکان ئەپرسێتەوە و، ئەتوانێ باوەڕیان لێ بسێنێتەوە.

لە بەر ئەوەی دەسەڵاتەکانی سەرۆکی وڵات دیاریکراوە، ئەنجومەنی وەزیران بەرزترین دەسەڵاتی کارگێڕی وڵاتن و، ئەوان سیاسەتی ناوخۆ و دەرەوەی وڵاتەکەیان جێبەجێ ئەکەن.

لە سیستەمی سەرۆکایەتی‌دا سەرۆک بە دەنگدانی گشتی هاووڵاتی‌یان هەڵئەبژێردرێ، لەم سیستەمەدا سەرۆک جگە لەوەی دەسەڵاتی زۆرە، خۆی وەزیرەکانی دائەنێ و، ئەنجومەنی وەزیران نیە و، سەرۆک خۆی کار بە وەزیرەکانی ئەسپێرێ و، لە بەردەم خۆی‌دا لێپرسراون.

ئەم جۆرە سیستەمە لە وڵاتانی دواکەتوی جیهانی سێیەمدا سەرەنجام ئەبێتە هۆی بەهێزبونی دەسەڵاتی سەرۆک و، لاواز بونی دەسەڵاتی پارلەمان و دەسەڵاتی قەزایی، بە واتایەکی تر دانانی بناغەی رژێمی دیکتاتۆری.

مادەی 2 ی پرۆژەکەی پارتی ئەنوسێ: "هاووڵاتی‌یانی کوردستان بە دەنگدانی نهێنێ گشتی راستەوخۆ سەرۆکێ هەڵئەبژێرن بۆ هەرێم نوێنەرایەتی‌یان ئەکا و بە ناوی ئەوانەوە لە ئاستەکانی ناوە و دەرەوە ئەدوێ و، هاوئاهەنگی لە نێوان دەسەڵاتەکانی فیدرالی و دەسەڵاتەکانی هەرێمدا ئەکا."

مادەی 3 ی پرۆژەکەی پارتی ئەنوسێ: "ماوەی ولایەتی سەرۆکی هەرێم چوار ساڵە و ئەشێ دو جار هەڵبژێردرێتەوە."

مادەکانی 5 و 6 و 7 ی تەرخان کراوە بۆ مەرجەکانی پاڵێوراوی سەرۆکایەتی و مەرجەکانی دەنگدەر و جۆری پالاوتن و هەڵبژاردنی.

مادەی 8 ی پرۆژەکە هەڵبژاردنی سەرۆکی هەرێمی ئاسان کردوە بەوەی هیچ مەرجێکی بۆ زۆرایەتی دەنگەکان دانەناوە کە بە دەستی ئەهێنێ وەکو "دوسێیەک" یا "لە نیوە زیاتر" ی دەنگی تێکرای دەنگدەران بەڵکو ئیکتیفای کردوە بە "زۆرایەتی سادە" کە ئەشێ ژمارەیەکی زۆر کەمی تێکرای دەنگدەران بێ.

مادەی 16 ی پرۆژەکەی پارتی ئەم خولەی هەڵبژاردنی سەرۆکی هەرێمی دەرهاویشتوە لەو رێوشوێنانەی لە مادەی 2 دا باس کراوە. لە باتی دەنگدانی گشتی ئەم خولەی سەرۆکایەتی کە ئەبێ 4 ساڵ بێ، بە دەنگی "زۆرایەتی ئەندامانی" ئەنجومەنی نیشتمانیی کوردستان هەڵئەبژێردرێ.

مادەی 4 پرۆژەکەی پارتی رێی لەوە بڕیوەتەوە کە ئەگەر لە مانگی 12 ی ساڵی 2005 دا سەرلەنوێ هەڵبژاردن لە عیراق بۆ کۆمەڵەی نیشتمانی و لە کوردستان بۆ ئەنجومەنی نیشتمانیی کوردستان کرایەوە (بە پێی قانونی ئیدارەی دەوڵەتی عیراق و بە پێی بڕیاری ئەنجومەنی ئاسایش) هەڵبژاردن بۆ سەرۆکی هەرێم دوبارە بکرێتەوە، چونکە ئەیانەوێ سەرۆکایەتییەکەی ئەو، بێ گوێدانە ئەو هەڵبژاردنانە، بۆ 4 ساڵ بەردەوام بێ.

خوێندنەوەی پرۆژەکەی پارتی دەری ئەخا کە ئەوان "سیستەمی سیاسی سەرۆکایەتی" یان گەرەکە و، ئەیانەوێ ئەو جۆرە سیستەمە لە کوردستاندا دابمەزرێنن، ئەمەش رەنگدانەوەی فەلسەفەی سیاسی سەرکردە و سەرکردایەتی حیزبەکەیانە.

ئەنجومەنی نیشتمانیی کوردستان پاش چەندین کۆبونەوە لە 21 ی 12 ی 2002 دا پرۆژەیەکیان ئامادە کرد کە ببێتە دەستوری کوردستانی عیراق. فراکسیۆنی پارتی لە تاووتوێ کردن و نوسینیدا بەشدار بون. مادەی 40 ی ئەو پرۆژەیە ئەڵێ: "سەرۆکی هەرێمی کوردستان بە هەمان رێگا هەڵئەبژێردرێ کە سەرۆکی کۆماری فیدرالی پێ هەڵئەبژێردرێ و ئەوەش بە قانون رێک ئەخرێ."

بە پێی مادەی 36 ی قانونی ئیدارەی دەوڵەتی عیراق کە گروپی کوردی لە مەجلیسی حوکمدا، لەوانە بەڕێزان تاڵەبانی و بارزانی، ئیمزایان کردوە، سەرۆکی کۆماری فیدرالی عیراق بە "دوسێیەک" ی دەنگی ئەندامانی کۆمەڵەی نیشتمانیی عیراق هەڵئەبژێردرێ و بە "سێچواریەک" ی دەنگەکانی لێ ئەخرێ. بەڕێز تاڵەبانی بەو جۆرە و بەو رێژەی دەنگە هەڵبژێردرا بە سەرکۆماری عیراق. بەم پێیە سەرۆکی هەرێمی کوردستانیش ئەبێ بە هەمان رێگا و بە هەمان رێژەی دەنگ هەڵبیژێردرێ و بە هەمان رێگا و بە هەمان رێژەی دەنگ لێ بخرێ.

سێیەم، ماوەی سەرۆکایەتی هەرێم

ماوەی سەرۆکایەتی لە ولاتێکەوە بۆ ولاتێکی تر ئەگۆڕێ. بە گشتی لە نێوان 4 تا 6 ساڵ دایە بەلام بە زۆری 4 ساڵە کە ئەشێ بۆ یەک جار هەڵبژێردرێتەوە. لە هەلومەرجی ئاساییدا ئەبێ لە کوردستانیش وابێ. بەلام کوردستان ئیستا لە گەڵ عیراق لە قۆناغی گواستنەوەدایە. ئەنجومەنی سەرۆکایەتی عیراق و ئەنجومەنی وەزیرانی عیراق و کۆمەڵەی نیشتمانیی عیراق و ئەنجومەنی نیشتمانیی کوردستان، بە پێی زەمانبەندییەک کە سوڵتەی ئیئتیلافی موەقەت و ئەنجومەنی حوکم و نوێنەری سکرتێری گشتی نەتەوە یەکگرتوەکان دایانناوە و، لە قانونی ئیدارەی دەوڵەت و لە بڕیاری ئەنجومەنی ئاسایش دا نوسراوە، هەڵبژێردراون و لە قۆناغێک دان کە پێی ئەڵێن قۆناغی گواستنەوە. لەم قۆناغەدا ئەبێ دەستوری عیراق تا 15 ی 8 ی 2005 بنوسرێ و ئامادە بکرێ بۆ ریفراندۆم و، دوای پەسەنددنی دەستور لە لایەن دەنگدەرانی عیراقەوە، ئەبێ لە مانگی 12 ی 2005 دا سەرلەنوێ هەڵبژاردن بۆ کۆمەڵەی نیشتمانیی عیراق و بۆ ئەنجومەنی نیشتمانیی کوردستان بکرێتەوە.

تەمەنی دامەزراوە هەڵبژێردراوەکانی بەغداد و کوردستان ئەبێ لە مانگی 12 ی 2005 دا تەواو ببێ.

لە دەستوری داهاتودا پەیکەری سیاسی و قانونی عیراق و، لە ناو ئەویشدا پەیکەری سیاسی و قانونی هەرێمی کوردستان دیاری ئەکرێ. چارەنوسی کوردستانی فیدرالی و جۆری فیدرالییەکەی و دەسەلاتەکانی و سنوری جوگرافییەکەی لە وێدا دیاری ئەکرێ و دانی پێدا ئەنرێ. بۆیە ئەبێ کورد هەوڵ بدا لە دەستوری داهاتودا مافەکانی و جۆری فیدرالییەکەی و تایبەتمەندییە نەتەوەییەکانی خۆی جێگیر بکا.

پرۆژەکەی پارتی ئەمانەی لە بەر چاو نەگرتوە. قانونی ئیدارەی دەوڵەت کە بە شێوەیەکی قانونی دانی بە حکومەتی هەرێمی کوردستاندا ناوە، تەنیا دانی بە "حکومەتی هەرێم و ئەنجومەنی نیشتمانیی کوردستان و دەزگای قەزایی هەرێمدا" ناوە. ئەو کاتە باسی سەرۆکی هەرێم لە گۆڕێ نەبوە لە بەر ئەوە لە دورونزیکەوە باسی سەرۆکایەتی هەرێم ناکا.

پرۆژەکەی پارتی داوا ئەکا سەرۆکی هەرێم بۆ 4 ساڵ هەڵبژێردرێ و، ئەشێ دو جاریش، هەر جارەی بۆ 4 ساڵ هەڵبژێردرێتەوە. هەمو کەس ئەزانێ پاڵێوراوی سەرۆکایەتی هەرێم بەرێز مەسعود بارزانییە، واتە لە ئیستاوە داوای 12 ساڵ سەرۆکایەتی ئەکەن بەو هەمو دەسەلاتەوە کە بۆیان داناوە.

چەند سەرنجێکی پێویست:

یەکەم،

پرۆژەکەی پارتی باسی جۆری هەڵبژاردنی سەرۆک ئەکا بەلام باسی لێخران و لابردنی نەکردوە. توخنی ئەوەش نەکەوتوە ئەگەر کۆچی دوایی کرد، پەکی کەوت، یاوازی هێنا، شوێنەکەی چۆن پڕ ئەکرێتەوە. رەنگە لە دنیادا ولاتێک نەدۆزینەوە، جگە

له كوردستان، كه دهستور يا قانونهكهى كه ريگهى دانانى سهرۆكهكهى باس ئهكا، باسى جۆرى لابردنيشى نهكا.

دوهم،

پرۆژهكهى پارتى له هيچ مادهيهكىدا ناوى جيگرى سهرۆك ناهينىَ. ههر ولاته ههلومهرجى تايبهتى خۆى ههيه له بهر ئهوه له ههندىَ ولات سهرۆك پيويستى به جيگر ههيه و له ههندىَ ولات پيويستى به جيگر نيه. له كوردستانيكدا كه هيشتا شوينهوارهكانى شهرِى ناوخۆى به زهقى پيوه ديارن و، هيشتا دو ئيدارهى جياواز و، دو هيزى چهكدارى جياواز و دو دهزگاى دارايى جياواز و دو سيستهمى ئاسايشى جياواز و، تهنانهت دو دهزگاى قهزايى جياواز، حوكمرِانى تىَدا ئهكهن، ئهگونجىَ سهرۆكى يهك لايان ببيته سهرۆكى ههردولايان و، به يهك چاو سهيرى ههردو لايان بكات و، به يهك جۆر رهفتار له گهلّ ههردو لايان بكات؟

سييهم،

پارتى به بيانوى سهلماندنى ئهم قانونهوه چهند مانگىَ كۆبونهوهى پارلهمانى ههلّبژيردراوى كوردستانى دواخست و، له باتى ئهوهى رىَ بدا به ئهنجومهنى نيشتمانيى كوردستان، به ريگهى ئوسولى، قانونى سهرۆكايهتى ههريم دابنيَن، سهركردايهتى يهكيتى راكيشا بۆ ئهوهى ههردو سهركردايهتى له باتى ئهنجومهن قانونهكه دابنيَن و بيسهپيَنن به سهر پارلهماندا، به مهش دوهمين ئهنجومهنى وهكو يهكهمين ئهنجومهن، پيش ئهوهى دهس به كار بىَ، كردهوه به نيوهگيان.(تهواو)

7 ى 5 ى 2005:

پيرمام، كۆبونهوهى هاوبهشى ههردو م س.

له يهكيتى: كۆسرهت رهسول، د بهرههم سالح، ئهرسهلان بايز.

له پارتى: نيچيروان بارزانى، فازيل ميرانى...

كۆسرهت و نيچيروان كۆنگرهيهكى رۆژنامهوانىيان گرتوه. سايتى پهيامنير بلاّوى كردۆتهوه:

دهقى قسهكانى ههردوكيان:

قسهكانى نيچيروان بارزانى بۆ پهيامنير

قسهكانى كۆسرهت رهسول بۆ پهيامنير

قسهكانى راگهياندنى پارتى بۆ پهيامنير

نيچيرڤان بارزانى: پيوست ناكات ههموو شتيكى خۆمان بهبهغداوه ببهستينهوه

كۆبونهوهى نيوان ههردوو مهكتهبى سياسى پارتى ديموكراتى كوردستان و يهكيتى نيشتمانى كوردستان له هاوينه ههوارى سهلاحهدين دواى چهندين سهعات گفتوگۆ بىَ ئهوهى خالّى كۆتايى لهسهر كيشهكان دابنيت كۆتايى پيهات، ئهندامانى مهكتهبى سياسى

یەکێتی گەڕانەوە تا ئەنجامی گفتوگۆکانیان لەگەڵ تێکڕای مەکتەبی سیاسیدا باس بکەن و مەکتەبی سیاسی پارتی دیموکراتیش بە تەنها درێژەی بە کۆبونەوە دا.

لە ماوەیەکی کورتی نێوان کۆبونەوە کەدا بەڕێز نێچیرڤان بارزانی لێدوانێکی چڕوپڕی سەبارەت بە دوا ئەنجاماکان و خاڵەکانی نا کۆیی نێوان هەردوولا و پێشکەوتنەکانی هەردوولا لەو بارەیەوە دا.

"یاسای سەرۆکی هەرێم بۆ کاک مەسعود نییە بۆ کوردە"

سەرۆکی حکومەتی هەرێمی کوردستان و ئەندامی مەکتەبی سیاسی پارتی دیموکراتی کوردستان سەبارەت بە ڕەوتی گفتوگۆکان گوتی: "بە نسبەت یاسای سەرۆکایەتی هەرێم بیر و بۆچونی ئێمە ئەوەی کە جارێ یەکەم شت ئەوە پەیوەندی بەکەسەکانەوە نییە، پەیوەندی بە جەنابی کاک مەسعودەوە نییە، یاسایەکە دا دەنرێت بۆ داهاتووی میللەتی کورد وەک دەستورێک. ئەوە ڕەغبەتی جەنابی کاک مەسعود نییە کە زۆر پێ لەسەر ئەوە دابگرێت کە فلان مادە یان بڕگە دەبێ لە یاساکەدا هەبێت، بە پێچەوانەوە فشارێکی یەکجار زۆر لە سەر خودی جەنابی کاک مەسعود هەیە بۆ ئەوەی وەک خزمەتێک بۆ میللەتی کورد ئەو پۆستە قەبوڵ بکات. جەنابی کاک مەسعود لە زۆر بۆنە ئەو قسەیەی کردووە و تەئکیدی کردۆتەوە کە بۆ ئەو شەرەفێکی گەورەیە کە پێشمەرگە بێت. دەمەوێ ئەوە ڕوون بکەمەوە بۆ ئەوەی میللەت تێ بگات.

خاڵی دووەم و ئەوەی کە بە نیسبەت ئێمەوە گرنگە لە بۆچووندا، لە نێوان ئێمە و یەکێتی هەندێک جیاوازی هەیە لەسەر ئەوەی کە سەرۆکی هەرێم چ جۆرە دەسەڵاتێکی هەبێت، ئێمە پێمان وایە کە نابێت سەرۆک شتێکی ڕەمزی (سەمبۆلێک) بێت، دەبێ دەسەڵاتی هەبێت. ئەوەش بەو مانایە نییە کە هەموو شتەکان بەدەست ئەوەوە بێت، بگرە دەسەڵاتەکان لە نێوان سەرۆکی هەرێم، سەرۆکی پەرلەمان و سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران دا بەش کراون. جەنابی سەرۆک بارزانی ئەگەر ئەوە قەبوڵ بکات ئەوا لە چوارچێوەی یاسایەکدا قەبوڵی دەکات. بە داخەوە ئەم گفتوگۆیەی کە ئێستا برادەرانی یەکێتی زۆر بە جدی دەیکەن دەبووایە پێشتر بیان کردبایە؛ ئێمە پێشتر پێمان وابوو کە ئەمانە هەمووی تەواوە و هەموو کێشەکان چارەسەر بوونە، بەڵام ئێستا بیر و بۆ چوونی جیا هەیە، من دەمەوێت قسەکان وا بکەم کە ئێمە دوو حزبی سیاسین لە کوردستاندا، ممکینە هەندێ بیرو بۆ چوونی جیاوازمان هەبێت سەبارەت بە دەسەڵات و کاری سەرۆکی هەرێم کە ئەوە پێوویست بەوە دەکات زیاتر باسی لێوە بکەین.

لەم کۆبوونەوەیەدا هەندێک باسمان لێوە کرد، ممکینە برادەرانی یەکێتی بیانەوێ هەندێ دڵنیایی وەرگرن لە بارەی ئەوەی کە لە داهاتوودا ئەگەر مام جەلال لە عێراقدا نەبووە سەرۆک کۆمار، ئەوا ئەوکاتە دەبێ شتەکانی ئێرەش پەیوەندی بەوەوە هەبێت. ئێمە بۆچوونێکی دیکەمان هەیە، ئێمە پێمان وایە دەستورێک بۆ کورد دا دەڕێژین ئەوەی کە هەمانە بۆ کوردستانە، بەڵام بۆ گرێنتی دی کە، ئێمە دەتوانین وەکو یەکێتی

و پارتی قسەی لەسەر بکەین؛ چی پێویست بێت بۆ دڵنیاییان وەکو حزبێکی سیاسی بکرێ، کە ئەوە مافی خۆیانە ئێمە ئێستا لەسەر ئەو مەسەلەیە لە گفتوگۆداین."

"سەرۆکی هەرێم، جێگری سەرۆکی هێزی پێشمەرگەی دەبێ"

وەک باس کراوە چەند ناکۆکییەکی گشتی لەسەر مەسەلەی ماوەی سەرۆکایەتی هەرێم، شێوەی هەڵبژاردن و دەسەڵاتەکانی سەرۆکی هەرێمی کوردستان لە نێوان پارتی و یەکێتی دا هەیە، نێچیرڤان بارزانی لەو بارەیەوە گووتی: " سەبارەت بە خاڵەکانی ناکۆکی وەک ئەوەی کە ئاماژەتان پێ کرد، تا ڕادەیەک مەسەلەی پێشمەرگە چارەسەر کراوە، چوونکە هێزی پێشمەرگە چ هی پارتی بێ یان یەکێتی، ئەوان پێشمەرگەی کوردن و دەبێ لە ژێر یەک سەرکردایەتیدا کۆ بکرێنەوە، ئەم سەرکردایەتیەش بە تەنیا بۆ پارتی یان یەکێتی نییە وە بە نیاز نیین جارێکی دی کە بۆ شەڕی ناو خۆ بەکاریان بێنین و دەمانەوێت هێزێکی چەکدارمان بۆ کورد هەبێت و دەبێ بخرێتە چوارچێوەیەکی دامەزراوەیی و ئەوە نەمێنێ کە ئەوە پێشمەرگەی پارتییە و ئەمەش پێشمەرگەی یەکێتییە. ئێمە لەسەر ئەوە هیچ کێشەیەکی ئەوتۆمان نییە، لەسەر ئەوە ڕێک کەوتووین کە وەک ئەوەی لە دەستورەکەدا دێ، سەرۆکی هەرێم سەرۆکی هێزی پێشمەرگە دەبێ و جێگری سەرۆکی هێزی پێشمەرگە دەکرێ لە برادەرانی یەکێتی بێت، بەڵام ئەو پێشمەرگەیە پێشمەرگەی کورد دەبێت."

"دەمانەوێ ماوەی سەرۆکایەتی بۆ چوار ساڵ بێت"

سەرۆکی حکومەتی هەرێم، سەبارەت بە خاڵی دووەمی ناکۆکی کە تایبەتە بە ماوەی سەرۆکایەتی گووتی: "ماوەی سەرۆکایەتی ئەوەی کە ئێمە باسی لێوە دەکەین، وەک پێشتریش گووتم ئێمە بە پێی دەستور دەمانەوێ بۆ چوار ساڵ بێ، ئەم چوار ساڵەش بۆ حاڵی حازر دەکرێ لە لایەن پەرلەمانەوە بێ، بەڵام دووای ئەوە بە دەنگی میللەت هەڵبژێردرێ، هەر کەس خۆی کاندید بکات، ببێتە سەرۆکی هەرێم".

"پێویست ناکات هەموو شتێکی خۆمان بە بەغداوە ببەستینەوە"

سەبارەت بە ئاستی پەیوەندی نێوان هەرێمی کوردستان و حکومەتی ناوەند و تایبەتمەندی یاساکانی هەرێمی کوردستان، نێچیرڤان بارزانی گوتی: "بە پێی یاسای کاتیی ئیدارەی دەووڵەت، پەرلەمانی کوردستان مافی ئەوەی هەیە یاسا دابنێت، پێم وا نییە پێویست بێ هەموو شتێکی خۆمان بە بەغداوە ببەستینەوە، فە پێچەوانەوە ئەوەی کە زۆر پێویستە کاری لەسەر بکرێت لەپەرلەمانی کوردستاندا ئەوەیە کە دەبێت هەرێمی کوردستان یاسای تایبەتی خۆی هەبێت، یاسا دابنێت و مافی خۆشییەتی دەستوری هەرێم دا بڕێژێت، پێم وایە پێویست ناکات هەرچی لە بەغدا هەبێت دەبێت لێرەش هەبێت".

"نە دەبوو مام جەلال سەفەری دەرەوە بکات"

سەرۆکی حکومەتی هەرێمی کوردستان لە کۆتاییدا وێڕای ئەوەی هیوای خواست کێشەکە بە زووترین کات چارەسەر بێت، ئاماژەی بە کاریگەری نێگەتیڤی ئەم دۆخە

کرد و گووتی: "بێ گوومان هەموو میللەتی کورد ئەمڕۆ چاویان لەوەیە کە پەرلەمانی کوردستان کۆ ببێتەوە و کابینەی پێنجەمی حکومەتی هەرێمی کوردستان دا بمەزرێ و بێگومان کاریگەری نێگەتیڤی دەبێت، لەگەڵ ئەوەشدا هەندێ ڕاستی هەیە دەبێ خەڵک بیزانن، ڕاستیەکە ئەوانەیە کە ئێستا باسن کرد، ئەمەش پێوویستی بە گفتوگۆ هەیە و پێم وایە لەو سەفەرەی کە بەڕێز مام جەلال کردی دەبووایە ئەوشتانە ئەوکات یەکلا بکرێنەوە، بە داخەوە ئەویش سەفەری دەرەوەی کرد و شتەکانی هەروا بەجێ هێشت، بەش بە حاڵی خۆم گەشبینم کە ئێمە دەگەینە ڕێککەوتن، مومکینە گفتوگۆی زیاتری پێویست بێت، بەڵام سەر ئەنجام دەگەینە ڕێککەوتن."

کۆسرەت ڕەسووڵ: هەردوولا نییەتی باشمان هەیە و دەمانەوێ بیرە جیاوازەکان یەک بخەین

ئەمڕۆ بەیانی بەڕێز کۆسرەت ڕەسووڵ، کارگێڕی مەکتەبی سیاسی یەکێتی نیشتمانی، سەبارەت بە کۆبوونەوەکەی دوێنێ شەوی پارتی و یەکێتی گووتی: "کۆبوونەوەی دوێنێ شەو کۆبوونەوەیەکی باش بوو، سەراحەتی تێدا بوو و هەردوولا ڕای خۆمان دەربڕی و ئەم کۆبونەوانە بەردەوام دەبن، ئێمە دەچینەوە لەگەڵ برادەرانی خۆمان قسە دەکەین، برادەرانی پارتیش لەگەڵ برادەرانی خۆیان قسان دەکەن و دەگەینە ئەنجامێکی باش."

کۆسرەت ڕەسووڵ لە درێژەی قسەکانیدا ووتی: " گرنگ ئەوەیە هەردوولا نییەتی باشمان هەیە، دەمانەوێ کێشەکان چارەسەر بکەین و ئەو بۆچوونە جیاوازانەی کە هەیە یەکییان بخەین و پێشم وایە کاک مەسعود دەبێتە سەرۆکی هەرێم."

شایەنی باسە دوێنێ شاندێکی مەکتەبی سیاسی یەکێتی بە سەرۆکایەتی کۆسرەت ڕەسووڵ کارگێڕی مەکتەبی سیاسی و دکتۆر بەرهەم ساڵح و ئەرسەلان بایز، ئەندامانی مەکتەبی سیاسی یەکێتی بۆ تاوتوێ کردنی کێشەکانی نێوان پارتی و یەکێتی سەبارەت بە مەسەلەی سەرۆکی هەرێمی کوردستان سەردانی هاوینەهەواری سەلاحەدین یان کرد و کۆبوونەوەکەیان تا سەعات 12 ی شەو درێژەی کێشا و هەروەها ئەمڕۆ بەیانیش بۆ ماوەیەکی کورت کۆبونەوەکە بەردەوام بوو. (تەواو)

وتارێکم نوسی ئەمڕۆ لە سایتی "ریفۆرم" دا بڵاوم کردەوە.

**ئەمە دەقەکەیەتی:**

**بۆچی**

**هەڵبژاردنی سەرۆکی هەرێمی کوردستان دواکەت؟**

چەند جار و لە چەند بۆنەی جیاوازدا بەڕێز بارزانی و سەرانی پارتی وەکو منەتێکی گەورەیان بە سەر یەکێتیەوە هەبێ ئەوە بە چاوی سەرکردەی یەکێتی و

سەران و جەماوەری یەکێتیدا ئەدەنەوە، کە ئەوان بەڕێز تاڵەبانییان کاندید کردوە بۆ پۆستی سەرۆکایەتی کۆماری عیراق و، ئەگەر ئەوان ئەوەیان نەکردایە ئەوە نەئەبو.

بۆ ئەوەی هاووڵاتی سادەی کوردی چەواشە نەبێ هەندێ شت هەیە رونکردنەوەی زیاتریان پێویستە:

لە پێشەوە هەمو کەس ئەوە ئەزانێ کە بەڕێز تاڵەبانی بە کودەتا نەبۆتە سەرکۆمار. ئەوە راستە کە ئەگەر رەزامەندی پارتی و لیستی هاوپەیمانی کوردستان و، پێ داگرتنی بەڕێز مەسعود بارزانی نەبوایە، ئەو پرۆسەیە بەو جۆرە سەری نەئەگرت یان لەوانە بو هەر سەر نەگرێ. تاڵەبانی خۆی و سەرانی تری یەکێتییش ئەوەیان چەند جارێ دوبارە و سێبارە کردۆتەوە. بەڵام بێگومان ئەوە دەسکەوتی یەکڕیزی کورد بوە و، کورد بۆ ئەوەی لە عیراقی نوێدا دەسکەوتی سیاسی گەورەتر بە دەس بهێنێ، ئەبێ لە نوسینی دەستور و لە پێشهاتەکانی عیراقدا بە یەکڕیزی بمێنێتەوە.

لە کۆبونەوە دوقۆڵییەکانی سەرکردایەتی یەکێتی و پارتیدا پۆستەکانی سەرۆکایەتی کۆماری عیراق و سەرۆکایەتی هەرێمی کوردستان لە تەرازویەکدا بەرامبەر یەک دانراون، بۆ ئەوەی هەریەکێ لەو دو سەرکردەیە، بە ویستی ئارەزومەندانەی خۆیان، یەکێ لەو دو پۆستە هەڵبژێرن.

لەم دابەشکردنەدا بەڕێز بارزانی سەرپشک کراوە کامیان هەڵبژێرێ. بەڕێز بارزانی پۆستەکانی بەو جۆرە دابەش کردوە و خۆی پۆستی سەرۆکایەتی هەرێمی کوردستانی هەڵبژاردوە. هەتا دوا رۆژەکانی ئەنجامدانی هەڵبژاردنی سەرۆکایەتی کۆماریش ئەم سەرپشکییە دانەخراوە، تەنانەت چەند جار بەڕێز تاڵەبانی و سەرانی تری یەکێتی داوایان لە بەڕێز بارزانی کردوە پۆستی سەرۆکایەتی کۆماری عیراق هەڵبژێرێ، لە هەمان کاتدا ئامادە بون بە هەمو توانایانەوە پشتیوانی لێ بکەن بۆ ئەوەی ئەو ببێتە سەرکۆماری عیراق.

بەدەسهێنانی پۆستی سەرۆکایەتی کۆماری عیراق سەرکەوتن نیە بۆ یەک کەس و یەک حیزب، بەڵکو سەرکەوتنە بۆ گەلی کورد، لە بەر ئەوەی:

یەکەمیان، بۆ یەکەم جارە لە مێژوی رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا کورد بتوانێ ئەو نەریتە سیاسییە دڕێوە بشکێنێ: کە تۆ لە بەر ئەوەی کوردی نابێ ببی بە سەرۆکی کۆمار، نابێ ببی بەسەرۆکی وەزیران، نابێ ببی بە وەزیری دەرەوە و ناوە و بەرگری و نەوت! ئەوەش داهێنانی نەریتێکی سیاسی تازەیە لە عیراقی نوێدا و لە ناوچەکەدا، سەرکەوتنێکە بۆ خەباتی کورد لە ئیستادا و رێ خۆش کردنێکیشە بۆ نەوەکانی داهاتو.

ئەبێ ئەم روداوە لەم روانگەیەوە سەیری بکرێ، نەک لە روانگەی دەسکەوتی کەسایەتی و حیزبایەتییەوە.

دوەمیان، کورد لە عیراقدا کە تائیستا لە پەراوێزی دەزگای بڕیاردانی سیاسیدا بوە، لەمەودوا بەم بەشدارییە ئەبێتە هاوبەشێکی کاریگەر لە دروستکردنی بڕیاری سیاسی عیراقیدا و، بێ ئەو و بێ ئاگاداری ئەو هیچ بڕیارێکی سیاسی نادرێ.

لێرەدا پرسیارێ دێتە پێشەوە: ئەی بۆچی هەڵبژاردنی سەرۆکایەتی لە بەغداد تێ پەڕی کەچی هەڵبژاردنی سەرۆکایەتی لە کوردستان تا ئیستا دواکەوتوە؟

ئەمە پرسیارێکی بە جێیە بۆ ئەوانەی لە نزیکەوە ئاگاداری مەسەلەکان نین. بەڵام زۆر رونە لای ئەوانەی خۆیان لە ناو روداوەکاندان. هۆیەکەیشی ئەوەیە: لە بەغداد رێوشوێنی هەڵبژاردنی سەرۆک و دەستەی سەرۆکایەتی و دەسەڵاتەکانی و ماوەی ولایەتەکەی و جۆری لێخرانی، پێش هەڵبژاردنەکان، زۆر بە وردی و رونی لە قانونی ئیدارەی دەوڵەتی عیراق "قاد" دا نوسرا بو. بەڵام لە کوردستاندا هێشتا قانونی سەرۆکایەتی هەرێم دانەنراوە تا رێوشوێنی هەڵبژاردن و دەسەڵاتەکانی و ماوەی ولایەتەکەی دیاری بکا. سەرکردایەتی پارتی بە لاساییکردنەوەی مۆدێلی بەغداد رازی نین، بەڵکو پرۆژەی قانونێکی نوێیان ئامادە کردوە، کە پێویستی بە تاووتوێ کردن و بڕیار لێ دان و پەسەندنی سەرکردایەتی هەردو حیزب و، ئەنجومەنی نیشتمانیی کوردستان هەیە.

کەواتە دواکەوتنی هەڵبژاردنی سەرۆکی هەرێمی کوردستان لە سۆنگەی هۆیەکی تەکنیکی بوە، نەک لە سۆنگەی هۆیەکی سیاسییەوە. بە واتەیەکی تر پیلانگێڕان و فرۆفێڵ نەبوە، وەکو هەندێ بێ ئاگا لێکی ئەدەنەوە، بەڵکو پرۆسەیەکی قانونی بوە. یەکێتی پەشیمان نیە لەوەی بەڕێز بارزانی هەڵببژێردرێ بە سەرۆکی هەرێمی کوردستان. ئەوە بەشێکی بێگومانی رێککەوتنەکەیە کە هێشتا جێبەجێ نەکراوە و، ئەبێ جێبەجێ بکرێ.(تەواو)

8 ی 5 ی 2005:

پارتی بەم بروسکەیە گفتوگۆکانی راگرت:

لە م س – پ د ک

بۆ م س – ی ن ک

ژمارە: 46

رۆژ: 8 ی 5 ی 2005

هەروەکو دەزانن لەم ماوەیەدا زنجیرەیەک کۆبونەوەمان ئەنجام دا لە سەر هەندێ مەسائیلی هەنوکەیی بۆ زەمینە خۆشکردن بۆ کۆبونەوەی پارلەمان و هەڵبژاردنی سەرۆکایەتی پارلەمان و تەواوکردنی یاسای سەرۆکی هەرێم و تەکلیفی سەرۆکی حکومەت و هەردو ئیدارەکە. بە داخەوە بێ ئەنجام بون. بۆیە پێمان باشە بۆ کۆبونەوەی داهاتو چاوەڕوانی گەڕانەوەی مام جەلال بین بۆ ئەوەی بە رێککەوتننامەی 01 ی 12 ی 2004 دا بچینەوە کە بە ئیمزای هەردو بەڕێزان بوە.

9 ی 5 ی 2005:
وتارێکم نوسی ئەمڕۆ لە سایتی "ریفۆرم" دا بڵاوم کردەوە.

**ئەمە دەقەکەیەتی:**
**تۆ بڵێی کێشەی**
**"سەرۆکایەتی: کۆمار و هەرێم"**
**ببێتە هۆی لە یەکترازانی یەکڕیزیی کورد؟**

کورد زۆر دڵخۆش بون بەوەی لە پێش روخانی سەدامەوە هێزە سیاسیەکانی کورد جۆرێ لە یەکڕیزیان بەرامبەر پێشهاتە چاوەڕوانکراوەکانی عیراق دروست کرد و، بەرامبەر پرسە چارەنوسسازەکان بیروبۆچون و هەڵوێستیان یەک خست و، بە یەکڕیزیەوە چونە ناو روداوەکانی عیراقەوە:
بە یەکڕیزی بەشداری مەجلیسی حوکم بون،
بە یەکڕیزی هەڵوێستی سیاسیان لە روداوەکانی عیراق دەربڕی،
بە یەکڕیزی بەشداری یەکەم کابینە بون،
بە یەکڕیزی بەرەنگاری گوشاری ناوەکی و دەرەکی بونەوە و بەشداری نوسینی قانونی ئیدارەی دەوڵەتی عیراق بون،
بە یەکڕیزی بەشداری وەزارەتە کاتیەکەی عەلاوی بون،
بە یەکڕیزی چونە هەڵبژاردنی گشتی عیراق و کوردستانەوە،
یەکڕیزیی کورد و هێزە سیاسیەکانی، ئەگەرچی هەمو جار روداوەکان دەریان ئەخست کە لەرزۆک و کاتیە، لە گەڵ ئەوەشدا بوە مایەی دڵخۆشی و سازدانی کوردی عیراق و گەشانەوەی هیوای هەمو نەتەوەی کورد و جێگەی رێزی دنیا و، چەندین دەسکەوتی سیاسی باشی بۆ کورد بەدی هێنا، لە سەرو هەموانەوە: سەلماندنی قانونیی دۆخی فیدرالی هەرێمی کوردستان و، بوژانەوەی ئابوری کوردستان و، خۆشبونی گوزەرانی خەڵک و، پتەوبونی پێوەندی سیاسی و ئابوری و رۆشنبیری... نێوان هەرێمی کوردستان و وڵاتانی دەرەوە.
بەشداریی چالاکانەی هاووڵاتیانی کوردستان لە عیراق و لە دەرەوە بە پەرۆشێکی زۆرەوە لە هەڵبژاردنەکانی عیراق و کوردستاندا، زەمینەیەکی باشی ساز کرد سەرکردایەتی کورد بەکاری بهێنێ بۆ بەدەسهێنانی دەسکەوتی کاریگەر لە بوارەکانی سیاسی، بەڕێوەبەرایەتی، ئابوری، تەنانەت هێزی پاراستنی هەرێم... دا و، بۆ چەسپاندنی دەسکەوتەکانی لە دەستوری داهاتوی عیراق و لە دەوڵەتی تازەی عیراقدا.
ئەنجامەکانی هەڵبژاردن و پرۆسەی سیاسی لە عیراقدا بە دوی خۆیدا چەند هەلی گۆڕینی بە باری باشەدا رەخساند:
لە سەر ئاستی عیراق

به دەسهێنانی دەنگی زیاتر لە 2 ملیۆن کەس و، 77 ئەندام لە کۆی 275 نوێنەر لە کۆمەڵەی نیشتمانی عیراقدا و، چەسپاندنی بونی کورد لە ناوەندی بڕیاردانی سیاسی عیراقدا لە ڕێگەی پایەکانی سەرۆکایەتی کۆمار و، جێگری سەرۆکی وەزیران و جێگری سەرۆکی کۆمەڵەی نیشتمانیی عیراق و، 8 وەزارەتی دەرەوە، شارەوانی، کارو کارو باری کۆمەڵایەتی، پلان، سەرچاوەکانی ئاو، بازرگانی، ژینگە و گەیاندن، لە کابینەی نوێی عیراقدا

لە سەر ئاستی کوردستان

نوێ کردنەوەی ئەنجومەنی نیشتمانیی کوردستان و، داهێنانی پایەی سەرۆکایەتی هەرێم و، ڕەخساندنی هەلی یەکگرتنەوەی دیمۆکراتی‌یانەی هەردو ئیدارەی هەولێر و سلێمانی و، یەکخستنی هێزەکانی پاراستنی هەرێم، هێزەکانی پێشمەرگە و ئاسایشی ناوخۆ...

ئەم دەسکەوتە سیاسی‌یانە هەر چاودێرێکی بێلایەن بە پێوانەی سیاسی هەڵیان بسەنگێنێ، وا ئەزانێ ئەمانە هەموی هەلی زێڕینیان بۆ کورد ڕەخساندوە و دەروازەی گۆڕانی سیاسی گەورەتریان لە رودا کردۆتەوە، بۆ ئەوەی یەکرێزی کورد پتەوتر بکات و بیخاتە سەر ڕێی دانانی ستراتیجی قۆناغی داهاتوی نوسینی دەستورێ کە مافەکانی کوردی تێدا دابین بکرێ و، شەریکایەتی کاریگەری کورد لە دەزگای بڕیاردانی سیاسی عیراقی داهاتودا جێگیر بکات و، ناوچە کوردستانی‌یەکانی دەرەوەی هەرێم بگێڕێتەوە سەر کوردستان و، سەرچاوە سروشتی‌یەکانی خۆی بهێنێتەوە ژێر دەسەڵاتی خۆی و، هێزی پاراستنی کوردستان ڕێک بخاتەوە.... کەچی، لە باتی ئەوە، سەرلەنوێ تەپوتۆزی گێژەڵوکەی گرژی و ئاڵۆزان لە وڵات هەڵی کرد.

وەرگرتنی پۆستی سەرۆکایەتی کۆماری عیراق لە لایەن کوردەوە، لە کاتێکدا ئەبو لە لایەن هەمو هێزە سیاسی‌یەکانی کوردستانی عیراقەوە بە خۆشی و شاییەوە پێشوازی لێ بکرێ و، بە سەرکەوتنێ دابنرێ بۆ هەموان، لە هەندێ شار و ناوچەی کوردستانی عیراقدا، بە لێدان و تێهەڵدان و سوکایەتی پێ کردنەوە رو بە روی بونەوە.

روداوەکانی ئەو چەند ڕۆژە دەریان خست کە ئەو یەکڕیزی‌یەی کورد لەرزۆک و کاتی‌یە و، بیری سیاسی سەرانی کورد تا چ ئەندازەیەک دیلی قازانجی تەسکی حیزبە و نۆڕینی سیاسی‌یان چەندە کورت و کەمخایەنە.

ئەم کێشەیە بە جێی خۆی. کێشەیەکی تریش بوە سەرباری.

لە بەرامبەر سەرۆکایەتی کۆماری عیراقدا ئەبو سەرۆکایەتی هەرێمی کوردستان هەڵبژێردێ. ئەمە بەشێ بو لە سەودایەکی سیاسی پیشوی نێوان یەکێتی و پارتی. کەس لاری لە جێبەجێ کردنی ئەم گرێبەندە سیاسی‌یە نەبو، بەڵکو هەڵبژاردنی سەرۆک، خۆی لە خۆیدا، بە هەنگاوێکی قانونی و سیاسی گرنگ دائەنرێ بەرەو بە دامەزراوکردنی داودەزگاکانی حکومەتی هەرێمی کوردستان. بەڵام لە کوردستان هێشتا قانونێ نەبو سەرۆکایەتی هەرێم رێک بخا. بۆ ئەم مەبەستە سەرکردایەتی پارتی

پرۆژەی قانونێکی دا بە سەرکردایەتی یەکێتی. سەرکردایەتی یەکێتی هەندێ تەعدیلی تێدا کرد. هێشتا گفتوگۆکان بە ئەجام نەگەیشتبون تەعدیلەکە بە پەشیمان بونەوە دانرا و، هەڕەشە و گوڕەشە دەستی پێ کردەوە و، بارودۆخەکە ئاڵۆزا.

ئەمەش دیسانەوە دەری خست یەکڕیزیەکەی کورد لەرزۆک و کاتیـیە.

پێ ئەچێ سەرۆکایەتی کۆمار و سەرۆکایەتی هەرێم کە ئەبو یەکڕیزیی کورد پتەوتر بکاو، جێێ کورد لە عیراقی نوێدا بەهێزتر بکا و، بنچینەکانی حوکمی فیدرالی کوردستان قایمتر بکا، یەکڕیزیی کوردی بەرەو لە یەکترازان بیات. (تەواو)

**10 ی 5 ی 2005:**

وتارێکی ترم نوسی ئەمڕۆ لە سایتی "ریفۆرم" دا بڵاوم کردەوە.

ئەمە دەقەکەیەتی:

**"ئەولەویات" ی کورد**

**لە گێژەڵوکەی سەرۆکایەتی هەرێمی کوردستان‌دا خەریکە بە با ئەچێ!**

هەمو حکومەتێ، هەمو حیزبێ، هەمو جوڵانەوەیەک، لە هەر قۆناغێکدا "ئەولەویات" ی قۆناغەکەی دیاری ئەکات و هەوڵی جێبەجێ کردنی ئەدات.

"ئەولەویات" ی کورد لەم قۆناغەدا چین؟

چەسپاندنی مافەکانی کورد لە دەستوری هەمیشەیی عیراقدا.

یەکخستنەوەی هەردو بەڕێوەبەرایەتی هەولێر و سلێمانی، لە بەڕێوەبەرایەتیـیەکی یەکگرتودا،

چەسپاندنی فیدرالی کوردستان،

گێڕانەوەی ناوچە کوردستانیـیەکانی دەرەوەی سنوری هەرێمی کوردستان بۆ سەر هەرێم،

گێڕانەوەی سەرچاوە سروشتیـیەکانی کوردستان بۆ ژێر دەسەڵاتی حکومەتی هەرێمی کوردستان،

دانپیانانی قانونیی و ناسینی هێزی پێشمەرگە وەکو هێزی پاراستنی هەرێمی کوردستان...

ڕۆژی 30 ی 1 ی 2005 هەڵبژاردنەکانی عیراق و کوردستان ئەنجام دران.

ڕۆژی 13 ی 2 ی 2005 ئەنجامەکانی هەڵبژاردنی ئەنجومەنی نیشتمانیی کوردستان لە لایەن کۆمیسیۆنی باڵاوە بڵاو کرایەوە. بەڵام نە ئەنجومەن کۆبوەوە و نە باسی هیچ کام لە "ئەولەویات" ی کورد کراوە. لەو ڕۆژەوە تائیستا، جگە لە باسی قانونی سەرۆکایەتی هەرێم، ئەویش کە پارتی لە دوای 18 ی 4 ی 2005 دەوە هێناویێتیە بەر باس، چ هەنگاوێ بۆ یەکێ لەو پرسە چارەنوسسازانەی کورد نراوە؟

ئەوەی تا ئیستا دیارە هیچ!

گریمان کورد سەرۆکی هەرێم و حکومەتی هەرێم و ئەنجومەنی هەرێمی نەبو، ئەشێ دەس لەو خواستە نەتەوەیی‌یانە هەڵبگرێ، یان هەموی بکا بە قوربانی کێشەی سەرۆکایەتی هەرێم؟

بێگومان پێویستە و ئەبێ کێشەی سەرۆکایەتی هەرێم چارەسەر بکرێ، بەڵام نابێ "ئەولەویاتی کورد" کە زۆر لە کێشەی سەرۆک گرنگتر و ژیانیی‌ترن لە گێژەڵوکەی سەرۆکایەتی هەرێمدا بەبا بدرێن!

کوردستانی عیراق، لەم قۆناغەدا، لە بەردەم وەرچەرخانێکی مێژویی دایە، عیراقی نوێ بنیات ئەنرێتەوە. هەر هەڵەیەکی سیاسی، بگرە هەر زەللەیەک، هۆیەکەی هەرچیەک بێت و بیانوەکەی هەر چۆنێ بێ، کارێکی کوشندە لە پاشەڕۆژی سیاسی کورد ئەکا، لە ئاستەکانی هەرێمی کوردستان و عیراق و ناوچەکە و لە ئاستی جیهانی‌دا. کێشەی کورد چەند بۆ پێشەوە چوە ئەوەندە زیاتر ئەچێتەوە بۆ دواوە. (تەواو)

12 ی 5 ی 2005:

وتارێکم نوسی ئەمڕۆ لە سایتی "ریفۆرم" دا بڵاوم کردەوە.

ئەمە دەقەکەیەتی:

**بەغداد کەڵک لە "ئەزمونی کوردستان" وەرئەگرێ،**

**یان کوردستان ئەبێ دەرس لە بەغداد فێر بێ؟**

لە دوای روخانی رژیمی بەعسەوە، لە 9 ی 4 ی 2003 دا، تا ئیستا لە بەغداد 3 جار وەزارەت پێک هێنراوە. لە هەر سێ وەزارەتدا کورد، لە رێگەی نوێنەرانی پارتی و یەکێتی‌یەوە، بەشدار بون.

وەزارەتی یەکەم "مەجلیسی حوکم" پێکی هێنا. مەجلیس 25 کەس بون لە بەر ئەوە ژمارەی ئەندامانی وەزارەتەکەش 25 وەزیر بون. وەزارەت سەرۆکی نەبو هەر مانگەی ئەو کەسەی ئەبوە "سەرۆکی نۆرەیی" مەجلیس، بە هاوکاری لە گەڵ حاکمی عیراق سەفیر پۆل بریمەر، کۆبونەوەی بە وەزیرەکان ئەکرد.

یەکەمین وەزارەت لە 3 ی 9 ی 2003 دا پێکهات تا 1 ی 6 ی 2004 لە سەر کار بو. لەم وەزارەتەدا 5 وەزیری کوردی تێدا بو کە پێنجیەکی وەزارەتەکەیان پێک ئەهێنا.

لە پارتی:

وشیار زێباری، وەزیری کاروباری دەرەوە

نەسرین بەرواری، وەزیری کاری گشتی (ئەمەریکی‌یەکان ناوی وەزارەتی شارەوانی‌یان گۆڕیوە بۆ کاری گشتی)

لە یەکێتی:

د لەتیف رەشید، وەزیری سەرچاوەکانی ئاو (ئەمەریکییەکان ناوی وەزارەتی ئاودێرییان گۆڕیوە بۆ سەرچاوەکانی ئاو)
محەمەد تۆفیق رەحیم، وەزیری پیشەسازی
لە یەکگرتوی ئیسلامی:
عەبدورەحمان سدیق، وەزیری ژینگە (وەزارەتێکی تازە- داهێنراو بو)

دوای گێڕانەوەی بە ناو سەروەری بۆ عیراق و، پێکهێنانەوەی سەرلەنوێی وەزارەت بە سەرپەرشتی ئەخزەر ئیبراهیمی نوێنەری سکرتێری گشتی نەتەوە یەکگرتوەکان و، بە هاوکاری لە گەڵ سەفیر بریمەر و، بە راوێژ لە گەڵ مەجلیسی حوکم، بە پێی "قاد" ئەنجومەنی سەرۆکایەتی کۆمار و ئەنجومەنی وەزیران پێک هات.
ئەنجومەنی سەرۆکایەتی ئەبو لە 3 ئەندام: سوننییەک و شیعەیەک و کوردێک پێک بێ، سەرۆکی کۆمار و 2 جێگری سەرکۆمار. یەکێ لە جێگرەکانی کە ئەبو کورد بێ د روژ شاوەیس، ئەندامی پارتی بو. دەسەڵاتی ئەنجومەنی سەرۆکایەتی و ئەندامەکانی "تەشریفاتی" بو، لە هەندێ حاڵەتدا مافی ڤیتۆیان هەبو، بەڵام سەیر ئەوە بو لەم عیراقە نوێیەدا سەرۆک و جێگرەکانی، جگە لە موچەی رەسمیی، مانگانە یەکی 1 ملیۆن دۆلاریان لە بەر دەسدا بو، بە ئارەزوی خۆیان سەرفی بکەن، بێ ئەوەی هیچ دەزگا و دائیرەیەک بۆی هەبێ لێیان بپرسێتەوە.

دوەمین وەزارەت لە 1 ی 6 ی 2004 دا پێکهات تا 28 ی 4 ی 2005 لە سەر کار مایەوە. لەم وەزارەتەدا جگە لە جێگری سەروەزیر 6 کورد بون بە وەزیر چونکە ژمارەی وەزارەتەکان زیادی کرد.
د ئەیاد عەلاوی، سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران
لە یەکێتی:
د بەرهەم سالح، جێگری سەرۆکی وەزیران
د لە تیف رەشید، سەرچاوەکانی ئاو
نەرمین عوسمان، وەزیری دەوڵەت بۆ کاروباری ژنان (وەزارەتێکی تازە- داهێنراو بو)
لە پارتی:
وشیار زێباری، وەزیری کاروباری دەرەوە
نەسرین بەرواری، وەزیری کاری گشتی
مەمۆ فراهان، وەزیری دەوڵەت بۆ کاروباری کۆمەڵی شارستانی (وەزارەتێکی تازە- داهێنراو بو)
لە بێلایەن:
بەختیار ئەمین، وەزیری مافی مرۆڤ

وەزیرە کوردەکانی یەکەمین وەزارەت، کە پاڵێوراوی پارتی و یەکێتی و یەکگرتو بون و،

وەزیرە کوردەکانی دوەمین وەزارەت، کە پاڵێوراوی پارتی و یەکێتی بون... چی‌یان بۆ کورد بە دەس هێناوە و چی‌یان بۆ کوردستان ئەنجام داوە. ئایا هاووڵاتی‌یانی کوردستان هەست بەوە ئەکەن لە بەغداد وەزیریان هەیە و، لە بەغداد شەریکێکی راستەقینەن لە کاروبارەکانی حکومەتی عیراقدا. کامانەن ئەو پرۆژانەی ئەوان، لە رێگەی وەزارەتە ناوەندی‌یەکانی بەغدادەوە، بۆ کوردستانیان ئەنجام داوە یا داناوە؟ کامانەن پرۆژەکانی ژێرخانی ئابوری و، کامانەن پاڵاوگەکانی نەوت و، ئیستگەکانی بەرهەمهێنانی کارەبا و، هێڵی ئاسنین و پرد و رێگاوبانە ستراتیجی‌یەکان؟

ئایا سەرکردایەتی کورد وەزیر ئەنێرێ بۆ بەغداد بۆ ئەوەی موچەی بەرز وەربگرن و، خانو و زەوی تاپۆ بکەن و، گرێبەستی قەڵەو ئیمزا بکەن و، پەیتا پەیتا سەفەری دەرەوە بکەن و، کەڵک لە "ئیمتیازات" وەزارەت وەر بگرن، یا ئەبێ بەرنامەیەکیان هەبێ بەشێ بێ لە بەرنامەی گەشە پێدانی ئابوری، کۆمەڵایەتی، رۆشنبیری، زانستی... کوردستان و، لەو چوارچێوەیەدا هەوڵ بدەن کار بۆ جێبەجێ کردنی بکەن؟ ئەوانە کە بە نوێنەرایەتی کورد لە وەزارەتدا بەشدار بون و بەشدار ئەبن:

– ئەگەر باش بکەن یان خراپ، کێ لێیان ئەپرسێتەوە و لە بەردەم کێدا لێپرسراون؟

– بونی وەزیرە کوردەکان لە وەزارەتەکانی بەغدادا بەو جۆرەی کە تا ئیستا هەبون، ئەگەر هەبن چی لە مەسەلەی کورد بۆ پێشەوە ئەبا؟ ئەگەر نەبن چی لە مەسەلەی کورد دوائەخا؟

بە هەمو وەزیرە کوردەکانی بەغداد، نەیانتوانی زمانی کوردی بخەنە سەر پاسپۆرتی عیراقی، نەیانتوانی زمانی کوردی بخەنە سەر دیناری عیراقی، نەیانتوانی زمانی کوردی بخەنە سەر پولی دارایی و پۆستە و، نەیانتوانی یەک ژمارە "وەقائیعی عیراقی" بە زمانی کوردی دەر بکەن. نەیانتوانی بەشێ لەو مافانەی دەربارەی "یەکسانی زمانی عەرەبی و کوردی" لە مادەی 9 ی "قاد" ا سەلمێنراوە جێبەجێ بکەن.

سێیەمین وەزارەت، کە لە 28 ی 4 ی 2005 دا دامەزراوە و تازە کەوتۆتە کار، جگە لە جێگری سەروەزیر 9 وەزیری کوردی تێدایە چونکە وەزارەتەکە لە جاران فراوانتر بوە. وەزیرەکان دیسان پاڵێوراوی پارتی و یەکێتین:

د ئیبراهیم جەعفەری، سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران

لە پارتی:

د رۆژ شاوەیس، جێگری سەرۆکی وەزیران
وشیار زێباری، وەزیری دەرەوە
نەسرین بەرواری، وەزیری کاری گشتی
ئیدریس هادی، وەزیری کار و کاروباری کۆمەڵایەتی
لە یەکێتی:
د بەرهەم سالح، وەزیری داڕشتنی پلان
د لەتیف رەشید، وەزیری سەرچاوەکانی ئاو
باسیت محەمەد، وەزیری بازرگانی
نەرمین عوسمان، وەزیری ژینگە
جوان فوئاد مەعسوم، وەزیری گەیاندن

ئەشێ لەم پرۆسە سیاسی‌یەدا کە عیراقی پێدا تێپەڕی کورد چەند دەرسێکی لێ فێر بێ:

دەرسی یەکەم، دەستاودەست کردنی ئاشتی‌یانەی دەسەڵات.

لە ماوەی 2 ساڵی رابوردودا 3 جار وەزارەت و وەزیرەکان لە بەغداد گۆڕان. دەسەڵاتی سیاسی، بە هێمنی و ئاشتی، بێ ئەوەی پێکادانی چەکدار رو بدا و بێ ئەوەی شەڕی ناوخۆ بقەومێ، لە نێوان هێزی سیاسی جیاوازدا، دەستاودەستی کرد.

ئەشێ لە کوردستان شتی وەها رو بدا!

دەرسی دوەم، خۆدەربڕینی موعارەزەی سیاسی.

ئازادی دەربڕینی بیروڕای جیاواز و ناکۆک، لە ناو هۆڵی کۆمەڵەی نیشتمانیی عیراقدا، لە ناو دەزگاجۆراوجۆرەکانی راگەیاندندا، بە بینراو و بیستراو و خوێنراوەوە.

رەخنە لە سەرۆکی کۆمار، لە سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران، لە وەزیرەکان، لە نوێنەرەکانی ناو پارلەمان...

ئازادی دەربڕینی ناڕەزایی لە سەر شارێ و لە ناو مەیدانە گشتی‌یەکانی بەغداد و شارەکانی تردا.

هەمو ئەو جۆرە خۆدەربڕینانەی موعارەزەی سیاسی بێ ئەوەی بدرێنە بەر گولله و بەر شاڵاوی سەرکوتکردن بکەون.

ئەشێ لە کوردستان شتی وەها رو بدا!

دەرسی سێیەم، لێپرسینەوە و رۆشنی لە کاروباری داراییدا.

حکومەتەکەی د عەلاوی و وەزیرەکانی بەندوباوێکی زۆریان بە دواوەوە بو سەبارەت بە تەشەنە کردنی گەندەڵی دارایی و بەڕێوەبەرایەتی. وەکو ئەوترا دائیرەکان و داوودەزگای وەزارەتەکانیان پڕ کرد بو لە خزم و دەسوپێوەند و ئەندامانی حیزبەکانی خۆیان و، گۆیا بایی سەدان ملیۆن دۆلار گرێبەستیان ئیمزا کردوە لە گەڵ کۆمپانیای بێگانە و خۆماڵی و، بە سەدان ملیۆن دۆلاریان لە دارایی گشتی بە فیرۆ داوە. ئەمە هەر قسە نەبو لە سەر زاری ئەم و ئەو، بەڵکو هەندێ لە بەڵگەکانی کەوت بوە دەس دەزگاکانی راگەیاندن. جگە لە رۆژنامەکانی عیراق، رۆژنامە بە ناوبانگەکانی دنیا لە سەریان ئەنوسین. لە بەر ئەوە دوای پێکهێنانی سێیەمین وەزارەت، سەرۆکی "دەستەی نیشتمانیی دەسپاکی گشتی" کە دەزگایەکی عیراقی سەربەخۆیە، سەفەری دەرەوەی عیراقی لە وەزیرەکانی وەزارەتەکەی د عەلاوی قەدەغە کردوە تا لێپرسینەوە لە دەفتەری داراییەیان تەواو ئەبێ. ئەم بڕیارەی "دەستەی دەسپاکی" لە بەغداد دەرچوە و جێبەجێ کراوە، ئەگەر بۆ رواڵەتیش بێت، لە کوردستانی 14 ساڵی رابوردودا شتی وەها روی نەداوە، وەکو لە داوودەزگاکانی حکومەتی هەرێمی کوردستاندا گەندەڵی نەبوبێ.

لێرەدا پرسیارەکەی سەرەوە دوبارە ئەبێتەوە:

بەغداد کەڵک لە "ئەزمونی کوردستان" وەرئەگرێ، یان کوردستان ئەبێ دەرس لە بەغداد فێر ببێ؟(تەواو)

**15 ی 5 ی 2005: یەکشەم**

سلێمانی، کۆبونەوەی م س لە ماڵی ئەرسەلان بایز.

ئامادەکان: کۆسرەت رەسول، عومەری سەید عەلی، عومەر فەتاح، مەلا بەختیار، ئەرسەلان بایز، جەلال جەوهەر، عوسمان حاجی مەحمود، عیماد ئەحمەد، محەمەد تۆفیق و بەندە.

نەهاتو: د کەمال فوئاد (چۆتە سەفەر)، مستەفا سەید قادر (چۆتە سەفەر)، عەدنان موفتی (نیگەرانە ئامادە نابێ)

کۆبونەوەکە تەرخان کرا بۆ باسی ناکۆکی یەکێتی و پارتی:

تێگەیشتن و هەڵوێستی هەردو لا لەم مەسەلانەدا ناکۆکن:

ماوەی هەڵبژاردنی سەرۆک. دەسەڵاتی سەرۆکی هەرێم. جۆری هەڵبژاردن. جێگری سەرۆک.

پاش گفتوگۆیەکی دوورودرێژ بڕیار درا:

یەکەم:

1. رێککەوتنی هەردولا کە لە 1 ی 12 ی 2004 کراوە تا هەڵبژاردنی داهاتو لە عیراق بەردەوام ئەبێ. ئێمە ئیلتیزام ئەکەین بە هەمو تەعەهوداتی خۆمان لەوانە سەرۆکی هەرێم و هەمو تەعەهودەکانی تر.

2. پاش نوسینی دەستور و، پێش و کاتی هەڵبژاردنی گشتی جارێکی تر هەردولا دابنیشن، بۆ ڕێککەوتنێکی تازە، لە سەر جۆری بەشداری هەڵبژاردن و دابەشکردنی پۆستەکانی عیراق و کوردستان.

دوەم:

1. سەرۆکایەتی هەرێمی کوردستان، بە مەرجێ 4 ساڵ ئەبێ بۆ پارتی (مەسعود بارزانی) ئەگەر سەرۆکی کۆماری عیراق یان سەرۆکی وەزیرانی عیراق بۆ یەکێتی (مامجەلال) 4 ساڵ بێ.

ئەگەر لە بەغداد پایەی سیادی (سەرکۆمار و سەروەزیر) بە مام جەلال نەدرا، لە کوردستان هەڵبژاردن بۆ سەرۆکی هەرێم ئەکرێتەوە.

2. ئەگەر ئەنجومەنی نیشتمانیی کوردستان بۆ 4 ساڵ بەردەوام بو سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیران و سەرۆکایەتی پارلەمان بە تەناوب ئەبێ. ساڵێک ئەنجومەنی وەزیران بۆ ئێمە ئەبێ و، ساڵێک بۆ پارتی تا هەر 4 ساڵەکە تەواو ئەبێ.

سێیەم:

1. ئیمە سیستەمی پارلەمانیمان بە لاوە پەسندە،

2. بە پێی ئەو شێوەیەی کە دەستوری عیراقی بۆ هەلبژاردنی سەرکۆماری دیاری ئەکا،

3. یان بخرێتە بەردەم پارلەمانی کوردستان بۆ دیاری کردنی.

4. بۆ دەنگدان:

ا. ئەگەر لە پارلەماندا بو بە دوسێیەکی دەنگی ئەندامانی پارلەمان بکرێ.

ب. ئەگەر لە ناو خەڵک دا هەڵبژاردن کرا پێویستە 50+1 ی دەنگی دەنگدەران بهێنێ.

ج. ئەگەر (ب) نەبو لە دەوری دوەم دا هەلبژاردن ئەکرێتەوە لە بەینی یەکەم و دوەم دا.

چوارەم:

1. ئەگەر ماوەی سەرۆکایەتی هەرێم، بۆ ماوەی گواستنەوە بێ تا هەڵبژاردنی داهاتو، ئەشێ جێگری نەبێ.

2. ئەگەر بۆ ماوەی 4 ساڵ بێ، ئەبێ جێگری هەبێ.

هەمو ئامادەبوانی کۆبونەوەکە کۆنوسەکەیان ئیمزا کرد.

وتارێکم نوسی ئەمڕۆ لە سایتی "ریفۆرم" دا بڵاوم کردەوە.

**ئەمە دەقەکەیەتی:**

**بەڵێ ململانێیە لە سەر دەسەڵات،**

**بەڵام چ جۆرە دەسەڵاتێ؟**

وەکو عەیبێکی گەورە بێ، هەندێ جار هەندێ کەس، بە تایبەتی لەوانەی، بێ باک و بێ پەروا، مل لە نوسینی وتار و کۆلکە وتار ئەنێن، حیزبەکانی کوردستان تاوانبار ئەکەن بە ململانێی دەسەڵات و، دابەشکردنی پۆست و پایە و وەزارەت و داوودەزگا گرنگەکان.

ئەم کارە ئەگەر جێگەی ناڕەزایی و سەرسوڕمانی کەسانێ بێ کە بە درێژایی تەمەنیان لە کوردستان دور نەکەوتونەتەوە و، ئاگایان لە تەجروبەی وڵاتانی دنیا نیە، هەر نەیسە، ئەشێ بە ئاسایی وەربگیرێ، بەڵام سەیر ئەوەیە هەندێ لەو خۆ بە رۆشنبیرزانانەی لە ئەوروپا خوێندویانە، یا ماونەتەوە، یا کەم و زۆر لە جۆری دابەشکردنی نەخشەی سیاسی حیزبەکانی ئەو وڵاتانە ئاگادارن، ئەوانیش بە ناڕەزاییەوە، بگرە هەندێ جار بە وشەی قێزەون و دزێو، هەوڵ ئەدەن بیروبۆچونەکانیان سەبارەت بە تاوانبارکردنی حیزبەکانی کوردستان و سەرکردەکانیان دەرببڕن.

رەنگە ئەوانە چەند جۆرێ بن:

هەندێکیان، ئەوانەن بە گەورەیی لە کوردستانەوە رۆیشتون وەکو خۆیان ماونەتەوە، کەڵکیان لە سودە دارایی و مادیەکانی وڵاتانی ئەوروپی وەرگرتوە، بەڵام کەڵکیان لە تەجروبە سیاسیەکانیان وەرنەگرتوە لە سۆنگەی زۆر شتەوە، لە سەرو هەمویانەوە نەزانینی زمان، شتێکی ئەوتۆ فێر نەبون.

هەندێکیان، داخ لە دڵن. لە دڵی خۆیاندا پێیان ناخۆشە بە کورد لە دایکیان بون. لە بەرامبەر ئەوروپیەکاندا هەست بە گرێی سایکۆلۆجی "خۆبەکەمزانین" ئەکەن. هەمو شتێکی کوردیان پێ خراپە و هەمو شت رەت ئەکەنەوە. رەتکردنەوەیان لێ بوە بە خو.

هەندێکیان، لایەندارن، خۆیان، خێزانەکەیان، بنەماڵەکەیان، یا تەنانەت عەشیرەتەکەیان پێشینەیەکی سیاسی یا پێوەندیەکی کۆمەڵایەتی لە گەل یەکێ لە حیزبەکان هەبوە. رەنگە کوژراویشی هەبێ. ئەمانە زۆر جار بێلایەنی لە دەس ئەدەن بەو "هەوا"یە ئەدوێن، کە لەو رابوردوەوە دێ.

هەندێکی تریان، باس و بابەت، وتار و لێکۆڵینەوە و پێشنیاری باش و بە کەڵک ئەنوسن. هەندێ لەوانەی کە لە کوردستان لە ناوەندەکانی بڕیاردانی سیاسیەوە نزیکن کەڵک لە بیروبۆچونەکانیان وەرئەگرن.

*

حیزبی سیاسی بۆچی دائەمەزرێ و بەرنامە دائەنێ و هەڵمەتی پرۆپاگاندە ئەبا و خەڵک لە خۆی کۆ ئەکاتەوە؟ بۆ ئەوە نیە دەسەڵات بگرێتە دەس و بەرنامەکەی لە بواری سیاسی، ئابوری، کۆمەڵایەتی، رۆشنبیری... دا جێبەجێ بکا؟ لە کوردستانیش وایە، بەڵام بە شێوەی خۆی.

بەڵێ ئەمڕۆ لە کوردستاندا کێشەی سەرۆکایەتی هەرێم هەیە. ئەمەش شێوەیەکی دەربڕینی ململانێی دەسەڵاتە لە کوردستاندا. تا ئەو کاتەی، ئەم ململانێیە، لە چوارچێوەی دیالۆگی سیاسی – قانونیدا ئەکرێ، کارێکی شارستانی و ئاساییە نەک تاوان و بە فیرۆدانی رەنجی تێکۆشەران و خوێنی شەهیدان.

هەرێمی کوردستانی عیراق، کە هەرێمێکی فیدرالییە، لە سنوری دەوڵەتی عیراق دایە، عیراق هێشتا دەستوری نیە، تازە خەریکی دانانی کۆمیتەی نوسینی دەستور و لێدوان و باس کردنین.

عیراقی نوێ بە پێی دەستورێکی نوێ، بنیات ئەنرێتەوە.

لەم عیراقەدا ئەشێ یەکێ لە دو سیستەمی سیاسی بێ بە فەلسەفەی دارشتنی دەستوری داهاتوی عیراق، کە ئیستا و تا پاشەڕۆژێکی نادیار، لە کوردستان و لە عیراق کاری پێ ئەکرێ، ئەویش: سیستەمی سەرۆکایەتی و سیستەمی پارلەمانییە.

بەڵێ ململانێیە لە سەر دەسەڵات، لە سەر ئەوەی کام لەم دو سیستەمە لە عیراقدا دەسەڵات بگرێتە دەس و، کام لەم دو سیستەمە لە کوردستاندا بچەسپێ.

ئەمە هیچ پێوەندییەکی بەوەوە نیە بەرێزان مەسعود و مام جەلال یان یەکێتی و پارتی کامیان زۆرتر دەسەڵاتیان هەبێ. ئەمە پێوەندی بە ئازادییەکانی ئیستای خەلک و وەچەکانی دوارۆژەوە هەیە، ئیستا چ جۆرە رژێمێکیان بۆ هەڵئەبژێرن.

ئەو رژێمەی ئیستا هەڵئەبژێردرێ و ئەسەپێنرێ، جگە لەوەی ئیستا حوکمی دانیشتوانی ئیستای کوردستان ئەکات، حوکمی وەچەکانی دوای ئیستا و نەوەکانی داهاتوش ئەکات.

جا پرسێکی ئاوەها گرنگ و چارەنوسساز:

ئەهێنێ ئیستی لە سەر بکرێ و لە سەری رابوەستن تا لە هەمو بارێکیەوە تاووتوێ ئەکرێ. لایەنە باش و خراپەکانی هەڵئسەنگێنرێ، ئینجا بڕیاری لێ بدرێ؟

یان بۆ رازی کردنی فلانە کەس و بۆ رازی کردنی فلانە حیزب، بلێن: "بیدە بەرێ با تێپەڕێ!"

لە کوردستان نە تەجروبەی سیستەمی سەرۆکایەتی و نە هی سیستەمی پارلەمانی نەبوە، بەلام لە عیراق تەجروبەی سیستەمی سەرۆکایەتی هەبوە، کە سیستەمەکەی سەدام حسێن و حیزبی بەعس بو. لە چەند ولاتێکی رۆژهەلاتی ناوەراستیشدا ئەم دو سیستەمە پێڕەوی ئەکرێ، بۆ نمونە:

میسر و ئێران سیستەمی سەرۆکایەتییان هەیە و،

ئیسرائیل و تورکیا سیستەمی پارلەمانییان هەیە.

لە سیستەمی پارلەمانیدا: پارلەمان سەرۆک هەڵئەبژێرێ، باوەڕ بە وەزارەت ئەبەخشێ و باوەڕی لێ ئەسێنێتەوە، وەزیرەکان ئەهێنێتە پای لێپرسینەوە. بودجەی سالانە تاووتوێ ئەکا و لە کوێدا پێویستی کرد دەسکاری ئەکا. سیاسەتی ناوەوە و دەرەوە دائەرێژێ. قانون بۆ ولات دائەنێ...

له سیستەمی سەرۆکایەتی‌دا: خەڵک سەرۆک هەڵئەبژێرن. سەرۆک، چونکە له لایەن خەڵکەوه دەنگی دراوەتێ، خۆی له پارلەمان به باڵاتر ئەبینێ. سەرۆک وەزیرەکانی هەڵئەبژێرێ و له بەر دەم خۆی‌دا بەرپرسیار ئەبن. سەرۆک سیاسەتی دەرەوه و ناوەوه دائەڕێژێ و، خۆی جێبەجێی ئەکا. کاروباری کارگێڕی و بەڕێوەبەری له بەر دەسەڵاتی خۆی‌دا ئەبن.

پارتی که پێ دائەگرێ له سەر سەپاندنی سیستەمی سەرۆکایەتی ئەزانێ چی ئەوێ. ئەیەوێ ئەو سیستەمەی چەندین ساڵه له ناو حیزبەکەی خۆی‌دا زاڵه، ئەوەش به سەر کۆمەڵی کوردستان‌دا بسەپێنێ. (تەواو)

20 ی 5 ی 2005: هەینی

قەڵاچوالان، کۆبونەوەی م س.

تاڵەبانی دوێنێ له بەغداد بۆ به لادا خستنی کێشەی نێوان یەکێتی و پارتی گەڕاوەتەوه بۆ قەڵاچوالان.

ئامادە: کۆسرەت رەسول، عومەری سەید عەلی، عومەر فەتاح، مەلا بەختیار، ئەرسەلان بایز، جەلال جەوهەر، عوسمان حاجی مەحمود، عیماد ئەحمەد، محەم تۆفیق، عەدنان موفتی، فوئاد مەعسوم، بەندە.

نەهاتو: کەمال فوئاد (چۆتە سەفەر)، مستەفا سەید قادر (چۆتە سەفەر)

کۆبونەوەکە تەرخان کرا بۆ باسی 2 بابەت:

1. هەلومەرجی عیراق
2. هەلومەرجی کوردستان

هەر فریای باسی یەکەم کەوتن، باسی دوەم دواخرا بۆ رۆژی دادێ.

21 ی 5 ی 2005: شەمە

دوکان، کۆبونەوەی م س.

ئامادەکان: کۆسرەت رەسول، عومەری سەید عەلی، عومەر فەتاح، مەلا بەختیار، ئەرسەلان بایز، جەلال جەوهەر، عوسمان حاجی مەحمود، عیماد ئەحمەد، محەمەد تۆفیق، عەدنان موفتی، فوئاد مەعسوم و بەندە.

نەهاتو: کەمال فوئاد (چۆتە سەفەر)، مستەفا سەید قادر (چۆتە سەفەر)

کۆبونەوەکە پێش تەواوکردنی بابەتەکانی دواخرا بۆ سەعات 20 بۆ ئەوەی فریای بەشداری ناشتنی تەرمی مەحمودی مەلا عیزەت بکەوین، کۆبونەوەکە خرایه شەو چونکه د فوئاد به بیانوی ئەوەی زەرورییه له بەغداد بێ ناتوانێ بۆ بەیانی بمێنێتەوه.

سەعات 20 دەستی پێ کرد. بابەتەکان هەمان بابەتی کۆبونەوەی یەکەم بو.

گێڕانەوەی هەلومەرجی بەغداد و هەڵوێست له حکومەت باس کرا.

بۆ نوسینی دەستور پێشنیارم کرد بە تەنیا بە جێی نەهێڵین بۆ ئەوانەی بەغداد. باری سەرنجی خۆمم رون کردەوە بەوجۆرەی لە وتاری "پرسی دەستور: کورد چۆن بەشداری نوسینی دەستور بێ؟" کە لە سایتەکەدا بڵاوم کرد بوەوە. پەسند کرا، بەڵام کێ جێبەجێی ئەکا؟

بابەتی دوەمی کۆبونەوەکە دەستی پێ کرد.

کۆسرەت وتی: ئێمە چەند کۆبونەوەمان کردوە و هەندێ شتمان ئامادە کردوە. کەوتە خوێندنەوەی بڕیارەکانی کۆبونەوەی 15 ی 05 ی 2005 یماڵی ئەرسەلان بایز. پێشتریش کۆنوسی ئەو کۆبونەوەیە و بەراوردکاری هەر 3 پرۆژەکەی قانونی سەرۆکایەتی درا بویە بیخوێنێتەوە.

تاڵەبانی جەوەکەی بە دڵ نەبو بە هەڕەشەی وازهێنان دەستی پێ کرد. گۆیا ئیستیقالەی لە سەرۆکایەتی کۆمار نوسیوە و، نوسخەیەکی لە بەغداد لای حاجم حەسەنی و نوسخەیەکی لای کۆسرەت داناوە، ئەگەر لە گەڵ پارتی رێک نەکەوتین پێشکەشی ئەکا. وتی: "65% ی ئیستیقالەکەم لە بەر ئێوەیە لە 35% ی لە بەر پارتییە... کەستان وەکو من پارتی ناناسن و نازانن ئەم ماوەیە چەندە داخیان کردۆتە دڵمەوە بەڵام من لایەنگری سازشم و دژی شەڕم" چەند جارێ شەڕی بە سەید عومەر فرۆشت. کۆبونەوەکە گرژی تێ کەوت. راگیرا بۆ نان خواردن. وا بە باش زانرا دوا بخرێ بۆ رۆژی دوایی.

تاڵەبانی وتی: "من و د فوئاد بە نوسین رەئی خۆمان ئەنوسین، بە بێ من کۆبونەوە بکەن، چیتان بڕیاردا من جێبەجێی ئەکەم."

22 ی 5 ی 2005:

یەکشەم

دوکان، کۆبونەوەی م س.

ئامادەبوان: کۆسرەت رەسول، عومەری سەید عەلی، عومەر فەتاح، مەلا بەختیار، ئەرسەلان بایز، جەلال جەوهەر، عوسمان حاجی مەحمود، عیماد ئەحمەد، محەمەد تۆفیق، عەدنان موفتی، بەندە.

تاڵەبانی هەمان پرۆژەی کە فەخری کەریم هێنا بوی "ملحق اتفاقیە 01 ی 12 ی 2004" بە کەمێ دەسکاری "ئینشائی‌یەوە" بە ئیمزای خۆی و د فوئادەوە نارد بو.

ئەندامانی م س کەوتونەتە هەڵوێستێکی دژوارەوە. نازانن چۆن هاوسەنگی لە نێوان بەرژەوەندی خۆیان و رەزامەندی تاڵەبانی و بەرژەوەندی یەکێتی‌دا رابگرن. ئەگەرچی هەندێکیان، لە نەبونی تاڵەبانی دا ئازایانە داکۆکی لە بۆچونەکانی خۆیان ئەکەن بەڵام لە بەردەم تاڵەبانی دا جۆرێکی تر قسە ئەکەن و رەئی ئەدەن. من نەمویست سەرپەرشتی کۆبونەوەکە بکەم بە کۆسرەت مان سپارد.

کۆسرەت هەوڵی دا بڕیارەکانی کۆبونەوەی 15 ی 05 ی 2005 بکا بە بەرنامەی گفتوگۆ، بەڵام ئەرسەلان و عەدنان و مەلا بەختیار، هەوڵیان دا "ملحق" ەکە بکەن بە بابەتی لێدوان و کردیان.

تا ماوەیەکی زۆر من هیچ قسەیەکم نەکرد کۆبونەوەکە 3 سەعاتی خایاند. لە کۆتاییەکەدا چەند قسەیەکم کرد بۆ ورد کردنەوەی هەندێ لە بەندەکانی. پێم وتن: "من باوەڕم بەم رێککەوتنە نیە و ئەوەی پێشوشم نەدیوە لە بەر ئەوە لەمەش دا من بەشداری ناکەم بەڵام دوای زیاتر لە 40 ساڵ نامەوێ لە گەل مام جەلال تێک بچم."

ئینجا هەمو چون بۆ ماڵی تاڵەبانی بۆ کۆبونەوە. دەسکارییەکانی قبوڵ بو. بە تەمایە بە فەخریدا بینێرێتەوە بۆ مەسعود.

24 ی 5 ی 2005: سێشەم

سلێمانی، کۆبونەوەی م س.

بە قسەی کۆسرەت، بە پێی تەلەفۆنێ کە عەدنان موفتی لە هەولێرەوە بۆی کردوە، پارتی پێشنیارەکانی یەکێتیی رەت کردۆتەوە. فەخری کەریم بڕیاری داوە بگەڕێتەوە بەغداد واز لە ناوبژی بهێنێ. بە چاکمان زانی کۆسرەت، محەمەد تۆفیق، عومەر فەتاح، سەردانی تاڵەبانی بکەن لە دوکان.

26 ی 5 ی 2005: پێنجشەم

مەسعود بارزانی نامەیەکی بۆ جەلال تاڵەبانی نوسیوە. ئازاد بەرواری و مەحمود محەمەد، بۆیان هێناوە بۆ دوکان. مام جەلال نامەکەی بۆ لێدوان بۆ ئێمە نارد بو. سەعات 18 لە بارەگای م س لە سلێمانی کۆبوینەوە بۆ باس کردنی. بە نوسین وەڵامەکەمان بۆ ناردەوە.

**دەقی نامەکەی مەسعود بارزانی بۆ تاڵەبانی:**

برای بەڕێز جەنابی مام جەلال پێشکەشە

سڵاوێکی گەرم

بە هیوای خۆشیتانم و ئومێدەوارم تەندروستیتان باشبێت. زۆر سوپاس بۆ نامەکەتان و چاوم بە کاک فخری کەوت، و منیش هاوبیرم لەگەڵ جەنابت کە یەکێتی هەڵوێست و ڕیزی کوردایەتی بەگشتی و هی پارتی و یەکێتی بە تایبەتی زۆر پێویستە لەم قۆناغە ناسک و گرنگەدا.

و هەر لە ڕوانگەی هەست کردن بە مسؤولیەتی مێژوویی دەمەوێ بیرو بۆچونەکانی خۆم برایانە بە ڕاشکاوی بۆ جەنابتان بنوسم.

ئەمە چوار مانگە هەڵبژاردنی پەرلەمانی کوردستان تەواوبووە و تائێستا پەرلەمان دانەنیشتووە، کە بەداخەوە ڕەنگدانەوەیەکی جوانی نەبووە، و نیگەرانیەکی زۆریش

دروست کردووه، و پرسیارێکی زۆر هەیە هەم لە خەڵکی کوردستان و هەم لە دۆستەکانمان بۆ تا ئێستا پەرلەمان کۆ نەبۆتەوە.

پێم وایە ڕێکەوتنی نێوان هەردووکمان لە 2004/12/1 هەنگاوێکی مسؤولانە بو و لەخزمەتی دوزی گەلەکەماندا بوو، و هەر ئەوە بو کە سەرکەوتنی گەورەمان بەدەست هێنا چ لەپەرلەمانی فیدراڵیدا چ لە پەرلەمانی کوردستاندا. و سەنگی کورد بەدەرکەوت.

پێویست ناکات بچمەوە ناو تفاصیلی ڕێکەوتنی 2004/12/1 بەڵام بەش بە حاڵی خۆم، دەمویست جەوێکی تازە دروست بێ لەکوردستان، و برینەکانی شەڕی خۆکوژی ساڕێژ بکرێن، و بڕوایەکی بەهێز دروست ببێت لەنێوان هەردوولادا.

و هەر بەو مەبەستە داکۆکیمان کرد کە دەبێ جەنابتان ئەو پۆستە سیاسیەی بەر کورد دەکەوێت لە بغدا وەری بگرن، ئەمما بەداخەوە تصورم نەدەکرد لەسەر سەرۆکی هەرێم برادەرانی یەکێتی ئەم هەمو هێنان و بردنە بکەن، کە بەڕاستی تامی تێدا نەماوە.

ئەمە مەسەلەیەکی شخصی نیە، بەڵکو دەرفەتە بۆ ئێمەی کورد مؤسسات دروست بکەین و خۆمان لە حزبایەتی تەسک ڕزگار بکەین. جەنابیشت دەزانی من داوای هیچ پۆستێکم نەکردووە و مەرجیشم بۆ قبوڵ کردنی سەرۆکی هەرێم ئەوە بووە کە ئەگەر خزمەتی یەکێتی هەڵوێست و ڕیزی پارتی و یەکێتی نیشتمانی و کوردایەتی بەگشتی بکات بەشکەم قبوڵی بکەم ئەگەر نە نامەوێت. و دوایی ئەوەی کە زۆر اصرار کرا و هەندێک لە برادەرانی هەردوولامان ئەهاتن و اصراریان کرد و وایان پشاندا کە دروست مەبەست خزمەتی ئەو مەرجەیە کە لەسەرەوە ئاماژەم پێ کردووە و لەهەموو لایەک زەمینە لەبارە. دوای ئەم هەمو تأکیداتە من نیمچە موافقەتم پیشاندا.

دوای ئەوەی هەردوو م.س دانیشتن بۆ هەنگاوی عەمەلی برایانی ی ن ک هەندێک بابەتی زۆر سەیریان هێنایە پێش کە هەموی کۆسپی سەیر بون. ولەوە سەیرتر قسەی وا دەکرا ئەگەر سەرۆکی هەرێم پارتی بێت و سەرۆکی وەزیرانیش هەر پارتی بێت ئەی یەکێتی چی بە سەر دێت.

برای بەڕێز:

بەڕاستی لە جەنابت ناشارمەوە من بەو تصوراتەی برایانی یەکێتی زۆر ناڕەحەت و نائومێد بووم. دروست من دەمویست لەو گرێیانە دەرباز ببین ، بەڵام دیارە هێشتا هەندێک ماون هەر لەناو ئەو گرێیانەدا دەژین، و هێشتا نیەتەکان پاک نەبونەتەوە، و دیارە هێشتا هەلومەرج لەبار نیە و بۆ ئەوەی کەس مەسەلەی سەرۆکی هەرێم نەکاتە بەهانە و کۆسپێکی وا بخاتە سەر ڕێگا کە زیان لە دوزی گەلەکەمان بدات، من برایانە بەجەنابت ڕادەگەیەنم من ئەصلا حەزم نەکردووە ببمە نە سەرۆک کۆمار لە بغدا نە سەرۆکی هەرێم، و من ئامادە نیم سەرۆکایەتی هەرێم قبوڵ بکەم لە ئەنجامی صەفقەیەک لە نێوان پارتی و یەکێتی. من وامزانی تفاهم کراوە و دوایی ئەم هێنان و بردنە چ تامی تێدا نەماوە، و بامەسەلەی سەرۆکی هەرێم دوابخرێت و نەبێتە کۆسپ. و ئەگەر

بەهەڵبژاردنی ڕاستەوخۆ بو باشە ئەگەر بە صفقە بو پێویست ناکات. با هەمو گەلی کوردستان ڕەئی خۆی بدات نەک تەنها دوو حزب.

و بۆ ئەوەی ئەم دەرفەتە لە دەست کورد نەچێت و هێشتا زۆر بابەتی سەرەکی ماون وەک (دستوری دائم، فیدرالی، کەرکوک، خانەقین و مندلی، مخمور و شێخان، شنگار و زمار) یەکلا نەکراونەتەوە، و ناشکرێن ئەگەر تەبا و برا نەبین. و هیمەتێکی بێ وێنەی دەوێت، و ئەگەر یەکریزی خۆمان نەپارێزین نە ئەو بابەتانە جێبەجێ دەبن نە دەستکەوتی ئێستاشمان دەمێنێ. بۆیە من داوا لە جەنابیشت دەکەم پشتگیری پێشنیاری من بکەی:

1. با پەرلەمان کۆ بینەوە. سەرۆکێک بۆ خۆی هەڵبژێرێت.
2. مەسەلەی سەرۆکی هەرێم تأجیل بکرێت.
3. هەوڵی جدی بدرێت هەردوو ئیدارە یەکبگرن و حکومەتەکی موحد بۆ هەرێم دابمەزرێت.
4. ئەگەر زەمینە جارێ لەبار نەبێت بۆ یەکگرتنی هەردوو ئیدارە با تنسیقێکی تەواو لە نێوانیاندا هەبێت.
5. لە بغدا یەک هەڵوێستمان هەبێت و وەک یەک تیم ئیش بکەن و بەهیچ شێوەیەک ڕێگە نەدرێت کەس یاری بەو هەڵوێستە بکات. و هەمان هاوکاری و تنسیق لە کوردستان بەهێزتریش بێت.
6. بە هەردووکمان هەوڵی زیاتر بدەین ئەو گرێ نەفسیانەی لای هەندێک کەس هەن نەهێڵین، و جەوێکی پڕ لە برایەتی و خۆشەویستی دروست بکەین لەناو قیادە و قواعدی پارتی و یەکێتی. چونکە بەداخەوە دیارە هێشتا ئەو جەوە دروست نەبووە. و تا ئەو جەوە دروست نەبێت فایدەی نیە.

ئەوا کاک فخری دەگەڕێتەوە بۆ لاتان و هەڤاڵان ئازاد بەرواری و محمود ئەندامانی م.س دێنە خزمەتتان و ئەم نامەیە دێنن. بۆ ئەوەی ئەگەر چ خاڵ پێویستی بە ڕونکردنەوی زیاتر هەبێت عەرزتان بکەن.

لەکۆتاییدا جارێکی تریش داکۆکی دەکەمە سەر برایەتی و هاوکاری نێوانمان و نابێ ڕێگە بە هیچ کەسێک بدەین وەزعەکەمان لێ تێک بدات. و ئومێدەوارم بەهەردووکمان سەرکەوین لە دروست کردنی جەوی برایەتی و بڕوا لەنێوان پارتی و یەکێتیدا.

ئیتر خۆشیتان ئاواتمانە

لەگەڵ ڕێزماندا

2005/5/25 براتان مسعود بارزانی

28 ی 5 ی 2005:

تاڵەبانی وەڵامەکەی ئێمەی بە دڵ نەبوە. بە تەنیا و تەنیا بە حیمایەی 2 سەیارە چۆتە سەلاحەدین بۆ بینینی مەسعود بارزانی. بە دو قۆڵی دانیشتون. پێ ئەچێ مەرجەکانی بارزانی هەمو قبوڵ کرد بێ.

دواتر د مەحمود عوسمان، کە بارزانی دیوە و لە زمانی ئەوەوە، بۆی گێڕامەوە، تاڵەبانی بە تەنیا لە گەڵ بارزانی دانیشتوە پێی وتوە: "من غەڵەتی 1964 دوبارە ناکەمەوە. ئەگەر تۆ سەرۆکایەتی هەرێم نەکەی منیش سەرۆکایەتی عیراق ناکەم. ئیستیقالەم نوسیوە پێشکەشیان ئەکەم و لێرە خانویەکم بدەرێ لای تۆ دائەنیشم..."
بارزانی بە د مەحمودی وتوە: "هەمو رێگاکانی لێ بەستمەوە ناچار وتم ئەبێ پرسی م س بکەم و سبەی جوابت لێ ئەگێڕمەوە."

29 ی 5 ی 2005:

قەڵاچوالان، نیوەڕۆ فازیل میرانی، ئازاد بەرواری، مەحمود محەمەد، عیزەدین بەرواری، سەردانی مام جەلالیان کردوە. "ملحق" ی رێککەوتنەکە و پرۆژەی قانونی سەرۆکی هەرێمیان بۆ هێناوە.

کۆبونەوەی م س یەکێتی.

تاڵەبانی، کۆسرەت رەسول، عومەر فەتاح، عەدنان موفتی، ئەرسەلان بایز، عیماد ئەحمەد، محەمەد تۆفیق، عوسمان حاجی مەحمود، مستەفا سەید قادر، جەلال جەوهەر، مەلا بەختیار، سەید عومەر و بەندە.

تاڵەبانی سەردانەکەی خۆی بۆ لای بارزانی گیڕایەوە. پرۆژەکانی ملحق و قانون دابەش کرا. باسی هەندێ لە بەندەکانی ملحق کرا بەڵام نەیهێشت باسی پرۆژەی قانونەکە بکرێ گۆیا لیژنەی قانونی باسی ئەکا.

ئێمە داوامان کردبو ئەگەر بارزانی بۆ 4 ساڵ ببێتە سەرۆکی هەرێم، جێگری هەبێ و، سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیرانی کوردستان بدرێ بە یەکێتی. بارزانی وتویەتی ئەوە کێشە ئەخاتە ناو خیزانەکەمانەوە من ئامادە نیم لە سەر لاشەی نێچیروان ببمە سەرۆکی هەرێم.

ئەوانەی پارتی داوایان کرد بو تاڵەبانی سەلماندویەتی:

نێچیروان بارزانی لە سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیران دا بمێنێتەوە.

مەسعود بارزانی ئەبێتە سەرۆکی هەرێم:

1. سەرۆکایەتی بۆ ماوەی 4 ساڵ ئەبێ نەک بۆ ماوەی گواستنەوە.
2. سەرۆک ئەمجارە لە پارلەمان دا و جاری داهاتو راستەوخۆ لە لایەن خەڵکەوە هەڵئەبژێردرێ، واتە قبوڵ کردنی سیستەمی سەرۆکایەتی.
3. سەرۆکایەتی بە زۆرینەی دەنگ ئەبرێتەوە نەک بە زۆرایەتی دوسێیەک.
4. سەرۆکی باڵای دەستەی کارگێڕی ئەبێ.
5. فەرماندەی هێزە چەکدارەکانی هەرێم ئەبێ.

6. هاوئاهەنگکاری نێوان هەرێم و ناوەند ئەبێ.
7. لە دەرەوە و ناوەوەی کوردستان نوێنەرایەتی هەرێم ئەکا و بە ناوی ئەوانەوە ئەدوێ.
8. جێگری نابێ.
تاڵەبانی ویستی مەسەلەکە بە بێ گفتوگۆ تێ بپەڕێنێ بە زویی کۆتایی بە کۆبونەوەکە هێنا.
بارزانی ئامادە نەبو لە سەر لاشەی برازاکەی ببێتە سەرۆک و دەستی لە بچوکترین داخوازی حیزبەکەی هەڵنەگرت کەچی تاڵەبانی لە سەر لاشەی هاوڕێکانی و حیزبەکەی قبوڵی کرد ببێتە سەرۆک.
لیژنەیەک پێک هێنرا لە: کۆسرەت رەسول، عومەر فەتاح، عەدنان موفتی، تا لەگەڵ نوێنەرانی پارتی دابنیشن بۆ یەکخستنەوەی حکومەت.

4 ی 6 ی 2005: شەمە
هەولیر، خولی دوەمی ئەنجومەنی نیشتمانیی کوردستان کرایەوە. د رۆژ شاوەیس کردیەوە چونکە د کەمال فوئاد وەکو زۆر جار لە سەفەر بو. شێخ بابە تایەری حەفید لە بەر ئەوەی لە هەمویان بە تەمەنتر بو کرایە سەرۆکی یەکەمین کۆبونەوەی ئەنجومەن و، ئەویش ئەندامەکانی یەک بە یەک بانگ کرد بۆ سوێند خواردن.
پاشان عەدنان موفتی (یەکێتی)، کەمال کەرکوکی (پارتی) و فرسەت ئەحمەد (پارتی) بون بە دەستەی سەرۆکایەتی.
تاڵەبانی و، حاجم حەسەنی – سەرۆکی ئەنجومەنی نیشتمانی عیراق و، نوێنەری ئەمەریکا و، نوێنەری ئێران و دواتر مەسعود بارزانی قسەیان کرد.

12 ی 6 ی 2005: یەکشەم
هەولێر، ئەمڕۆ ئەنجومەنی نیشتمانیی کوردستان کۆ ئەبێتەوە بۆ ئەوەی مەسعود بارزانی سوێندی سەرۆکایەتی لە بەردەمدا بخوا. من نەچوم بۆ بەشداری مەراسیمەکە.

هەندێ لە ئەندامانی م س لە ماوەی رابوردودا چاپلوسییان بۆ تاڵەبانی ئەکرد و، بۆ ئەوەی لە دابەشکردنەوەی پلە و پایەکانی قۆناغی تازەی داودەزگاکانی عیراق و کوردستان دا جێگەکیان بەر بکەوێ بیانویان دائەتاشی بۆ ئەوەی هەرچی زوتر قانونی سەرۆکایەتی هەرێم، بەو جۆرەی سەرکردایەتی پارتی داوایان کرد بو، پەسند بکرێ و، خۆیشیان ئەیان زانی داکۆکی لە بابەتێکی نارەوا ئەکەن بە قازانجی یەکێتی نیە. سەرەڕای ئەوەش هەندێکیان، هەندێ جار، مەراییان بۆ مەسعود و نێچیروان ئەکرد.
ئەمانە هەر یەکەیان مەبەستێکی تایبەتی خۆیان هەیە:

کۆسرەت رەسول، ئەیەوێ ببێتە سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیرانی یەکگرتوی هەرێم یان ببێتە جێگری سەرۆک.

د بەرهەم سالح، ئەیەوێ ببێتە وەزیری دەرەوەی عیراق یان جێگری سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیرانی عیراق.

د فوئاد مەعسوم، ئەیەوێ ببێتەوە بە ئەندامی ئەنجومەنی نوێنەرانی عیراق و کچەکەی ببێتەوە بە وەزیر.

عەدنان موفتی، ئەیەوێ ببێتە سەرۆکی ئەنجومەنی نیشتمانی کوردستان.

عیماد ئەحمەد، ئەیەوێ ببێتە وەزیر لە حکومەتی یەکگرتودا.

ئەرسەلان بایز و مەلا بەختیار، ئەیانەوێ تاڵەبانی لێیان رازی بێ و، لە شوێنەکانی خۆیان دا بمێننەوە. بە "ئاگاییەوە" بونەتە پارێزەری "دەعوایەکی ناحەق".

15 ی 6 ی 2005:

وتارێکم نوسی ئەمڕۆ لە سایتی "ریفۆرم" دا بڵاوم کردەوە.

ئەمە دەقەکەیەتی:

**تەنگوچەڵەمەی سەرۆکایەتی هەرێم کۆتایی هات**

**بەڵام...**

رۆژی 19 ی 5 ی 1992 خەلکی کوردستان بەشداریەیەکی فراوانیان لە هەلبژارنی یەکەمین خولی ئەنجومەنی‌ی نیشتمانی کوردستان دا کرد. ئەم خولە، لە بەر ناڕەزایی هەندێ لایەن و لەکەدار کردنی بە تەزویر، بە تایبەتی لە لایەن پارتی‌یەوە، شەوی راگەیاندنی ئەنجامەکانی، بۆ بە لاداخسنی کێشەکان "سەرکردایەتی بەرەی کوردستانی" بە ئامادە بونی هەمو لایەنەکانی بەشداری هەڵبژاردنەکە، بڕیاری دا ئەنجامەکانی ئەم هەڵبژاردنە بۆ 6 مانگ کاری پێ بکرێ، بەڵام دوای 6 مانگ هەڵبژاردن بۆ ئەنجومەنی نیشتمانی و بۆ رابەری بزوتنەوەی کورد دوبارە بکرێتەوە.

شەش مانگ تێپەری، بێ ئەوەی هیچ لایەک باس لە هەڵبژاردنەوەی نوێ بکاتەوە. بەڵکو مەسەلەکە بە تەواوی چوە خانەی فەرامۆشی‌یەوە. شەڕی ناوخۆی بە سەردا هات. کوردستان دو بەش و حکومەتی هەرێمی کوردستان دو لەت بو. ئەگەرچی شەڕ راگیرا و ئەنجومەنی نیشتمانی سەرلەنوێ بە یەکگرتویی کۆبوەوە، بەلام نە کوردستان یەک خرایەوە و نە حکومەتی هەرێم. هەڵبژاردنەوە تەنیا وەکو کەرەستەیەکی پرۆپاگاندە باس ئەکرا تا سەدام روخا و هێزەکانی ئەمەریکا و هاوپەیمانەکانی هاتنە ناو عیراقەوە.

هەڵبژاردنی گشتی لە عیراق دا بو بە خواستێکی جەماوەری. دەسەڵاتی ئەمەریکی و، ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتوەکان بڕیاریان لێ دا. کۆمیسیۆنی باڵای هەڵبژادرنەکانی عیراق، کە لە لایەن رێکخراوی نەتەوە یەکگرتوەکانەوە دانرا بو، رۆژی

30 ی 1 ی 2005 دانا بە ڕۆژی هەڵبژاردنەکانی عیراق: هەڵبژاردنی کۆمەڵەی نیشتمانیی عیراق، ئەنجومەنی پارێزگاکانی عیراق، ئەنجومەنی نیشتمانیی کوردستان.

سەرکردایەتی کورد کە 12 ساڵ بو ئامادەیی نەکرد بو بۆ هەلبژاردنەوەی ئەنجومەنی نیشتمانیی کوردستان، ئەیتوانی بایکۆتی هەڵبژاردن بکا، بەڵام نەیئەتوانی چیتر دوای بخات.

«»

روژی 30 ی 1 ی 2005 هەڵبژاردن لە کوردستان دا، وەکو زۆر شوێنی تری عیراق، بە گەرمی ئەنجام درا. خەڵکی کوردستان بەشدار بون لە هەڵبژاردنی نوێنەرەکانیان دا بۆ هەر 3 دەزگا، لەوانە ئەنجومەنی نیشتمانیی کوردستان.

خەڵکی کوردستان بە هیوا بون زۆر زو ئەنجومەن کۆ ببێتەوە. بە هیوا بون پێش کۆبونەوەی کۆمەڵەی نیشتمانیی عیراق، ئەنجومەنی نیشتمانیی کوردستان کۆ ببێتەوە. بەڵام هیواکەیان نەهاتە دی. کۆمەڵەی عیراق کۆبوەوە و، کەوتە سەر ڕێی کاری ئاسایی خۆی، هێشتا کوردستان چاوەڕوان بو.

سەرکردایەتی هەردو حیزب بڕیاریان دا ڕۆژی 24 ی 4 ی 2005 لەساڵیادی بۆردومانی قەڵادزەدا یەکەم دانیشتنی دەس پێ بکا. کۆبونەوەکە دوا خرا.

جارێکی تر بڕیاریان دا ڕۆژی 30 ی 4 ی 2005 کۆبونەوەکانی دەس پێ بکا، ئەویش دوا خرا بۆ کاتێکی دیاری نەکراو.

«»

ڕۆژی 4 ی 6 ی 2005 دوەمین خولی ئەنجومەنی نیشتمانیی کوردستان پاش رابوردنی 4 مانگ لە تەمەنی دەستی کرد بە یەکەمین کۆبونەوەی.

ڕۆژی 8 ی 6 ی 2005 قانونی ژمارە 1 ی ساڵی 2005 ی سەرۆکایەتی هەرێمی کوردستانی عیراقی پەسەند کرد.

ڕۆژی 12 ی 6 ی 2005 بەڕێز مەسعود بارزانی هەڵبژارد بە سەرۆکی هەرێمی کوردستانی عیراق.

ڕۆژی 14 ی 6 ی 2005 بەڕێز مەسعود بارزانی لە بەردەم ئەندامانی ئەنجومەنی نیشتمانیی کوردستان و، کۆمەڵێ میوانی کورد و عیراقی و بێگانەدا، سوێندی یاسایی خوارد.

هەڵبژاردنی بەڕێز بارزانی بۆ سەرۆکایەتی هەرێم و سوێند خواردنی یاسایی لە بەردەم ئەنجومەن دا، گۆڕانێکی گرنگە لە هەرێمی کوردستان دا، گۆڕانە بەرەو بە دامەزراو کردنی داوودەزگاکانی حوکمڕانی لە کوردستان دا، بەرەو دامەزراندنی دەوڵەتی داوودەزگا.

«»

ئەو چەند مانگەی ئەنجومەنی نیشتمانی کۆنەبوەو و، پرۆسەی سیاسی لە کوردستان دا کۆسپی تێ کەوت بو، کێشەی سەرەکی نێوان یەکێتی و پارتی لە سەر

ئەوە نەبو کێ سەرۆکی هەرێم بێ، بەڵکو لە سەر ناوەرۆکی "قانونی سەرۆکی هەرێم" بو.

پارتی پێی دائەگرت کە هەتا هەردو سەرکردایەتی پارتی و یەکێتی لە سەر قانونەکە رێک نەکەون، ئەوا:

کۆبونەوەی ئەنجومەنیی نیشتمانیی کوردستان ناکرێ،

ئامادە نین باسی یەکخستنەوەی ئیدارەکان بکەن،

گیروگرفتی ئەنجومەنی پارێزگای کەرکوک بە هەڵواسراوی ئەمێنێتەوە...

پارتی پرۆژەیەکی بۆ قانونی سەرۆکایەتی هەرێم ئامادە کرد بو، ئەیویست بە بێ دەسکاری و لێدوان، بە سەر یەکێتیدا بسەپێنێ و، یەکێتی بەرامبەر ئەنجامدانی کۆبونەوەی پارلەمان و یەکخستنەوەی ئیدارە قبوڵی بکا. یەکێتی هەندێ لە مادەکانی تەعدیل کرد. تەعدیلەکان پێوەندییەکیان بە هیچ کەس و کەسایەتییەک و بە هیچ دەسکەوتێکی سیاسی حیزبییەوە نەبو، پێوەندییان بە سەرەتاکانی بیری دیمۆکراسی و جۆری تێگەیشتنەوە هەبو لە ژیانی دیمۆکراتی.

پارتی زۆری تەعدیلەکانی قبوڵ نەکرد، بە تایبەتی بنەڕەتییەکانی، ئەیویست وەکو هەبو قبوڵ بکرێ.

پارتی بۆ ئەوەی مەرجەکانی خۆی بسەپێنێ:

لە لایەکەوە پێی داگرت لە سەر خواستەکانی خۆی و، کۆبونەوە هاوبەشەکانی یەکێتی و پارتی راگرت و، بە ئاشکرا لە راگەیاندنی رۆژنامەوانی دا درکاندیان کە ئیتر لە گەڵ مەکتەبی سیاسی یەکێتی کۆ نابنەوە. ئەبێ بەڕێز تاڵەبانی خۆی بگەڕێتەوە بۆ ئەوەی بە رێککەوتنی 1 ی 12 ی 2004 دا بچنەوە.

لە لایەکی ترەوە کەوتە هەڕەشەی بە کارهێنانی هەمو "کارتەکان". هەڕەشەیەک کە بۆنی خوێنی لێ ئەهات. دزەیان بە هەندێ هەواڵ کرد بۆ سایتی عەرەبی "ایلاف" گۆیا ناکۆکییەکان ئەگوێزنەوە بۆ بەغداد.

یەکێتی هەوڵی دا گفتوگۆکان راستەوخۆ لە نێوان نوێنەرانی هەردولادا، بێ دەستێوەردانی ناوبژیوان و لایەنی سێیەم، نەپچڕێ و بەردەوام بێ تا ئەگەن بە ئەنجام. سەرەتا پارتی ئەمەی پەسەند کرد.

رۆژی 7 ی 5 ی 2005 بۆ درێژە پێ دانی گفتوگۆی راستەوخۆ و روبەڕو بەڕێزان کۆسرەت رەسول و ئەرسەلان بایز چون بۆ سەلاحەدین بۆ بینینی بەڕێزان فازیل میرانی و نێچیروان بارزانی. گەیشتنە جۆرێ لە پێکهاتن. بەڵام بۆ رۆژی دوایی پارتی لێی پەشیمان بوەوە کاری پێ نەکرد.

بەڕێزان د مەحمود عوسمان و فەخری کەریم کەوتنە ناوبژی و هاتوچۆ و پرۆژەیەکیان ئامادە کرد بو کە ببێتە "ملحق" ی رێککەوتنی 1 ی 12 ی 2004. ئەم پرۆژەیە چەند جارێ تاووتوێ کرا. لە سەر هەندێکی کۆک و لە سەر هەندێکی ناکۆک بون.

پارتی گفتوگۆکانی یەکێتی - پارتی، تەنانەت تەقەلای ناوبژیوانەکانیشی، راگرت تا گەڕانەوەی سەرۆک تاڵەبانی، وەکو لە دەزگاکانی راگەیاندن دا بڵاویان کردەوە. سەرانی پارتی هیوایان بەو بو "تەنازول" یان بۆ بکات و داواکانیان بسەلمێنێ.

رۆژی 18 ی 5 ی 2005 سەرۆک تاڵەبانی لە بەغدادەوە گەڕایەوە قەڵاچوالان.

گفتوگۆی ناوخۆی یەکێتی و، ئاڵوگۆڕی بیروڕا، لە رێگەی لایەنی سێیەمەوە، لە نێوان یەکێتی و پارتی، یان وردتر لە نێوان بەڕێزان تاڵەبانی و بارزانی دا، دەستی پێ کرد.

رۆژی 24 ی 5 ی 2005 تاڵەبانی نامەیەکی تایبەتی بۆ بارزانی نوسی بەڕێز فەخری کەریم بۆی برد.

رۆژی 25 ی 5 ی 2005 بارزانی وەڵامی نامەکەی تاڵەبانی بە فەخری کەریم دا ناردەوە. بەڕێزان ئازاد بەرواری، مەحمود محەمەدی لە گەڵ نارد بون.

رۆژی 28 ی 5 ی 2005 تاڵەبانی بۆ سەردانی بارزانی بە تەنیا، بێ ئەوەی هیچ کەس لە ئەندامانی مەکتەبی سیاسی لە گەل خۆی ببا، چو بۆ سەلاحەدین. بۆ ئەوەی کۆتایی بە تەنگوچەڵەمەکە بهێنێ و، دەرگای پرۆسەی سیاسی لە کوردستان دا بکاتەوە، داوا بنەڕەتییەکانی پارتی، کە لە "قانونی سەرۆکی هەرێم" دا نوسرا بون، سەلماند:

1. سەرۆک، نەک تا تەواوبونی ماوەی گواستنەوە لە 15 ی 12 ی 2005 دا بەڵکو بۆ ماوەی 4 ساڵ سەرۆکایەتی ئەکا.

2. سەرۆک، ئەمجارەیان لە ئەنجومەنی نیشتمانی دا هەڵئەبژێردرێ، بەڵام جاری دوەم و سێیەم راستەوخۆ لە لایەن خەڵکەوە هەڵئەبژێردرێ. واتە لە کوردستان دا سیستەمی سەرۆکایەتی دائەمەزرێ.

3. سەرۆک، خولی یەکەم لە ئەنجومەن دا بە زۆرینە و خولەکانی داهاتو لە ناو خەڵک دا بە زۆرینە هەڵئەبژێردرێ. واتە هیچ مەرجێک بۆ رێژەی دەنگدان وەکو "لە نیوە زیاتر" یان "دوسێیەکی دەنگەکان" پێڕەوی ناکرێ.

4. سەرۆک، جگە لە خولی یەکەم، کە ئەم چەند مانگە و 4 ساڵی دوای هەڵبژاردنی گشتی ئەبێ، دو جاری تر قابیلی تازە کردنەوەیە، واتە ئەشێ بە گشتی 12 ساڵ و چەند مانگێ سەرۆک بێ. (ئەنجومەنی نیشتمانی تەعدیلی ئەم مادەیەی کردوە و ماوەی سەرۆکایەتی یەک جار تازە ئەکرێتەوە)

5. سەرۆک، جێگری نابێ. ئەگەر بۆ ماوەیەکی کورت لە کار دور کەوتەوە سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران بە کارەکانی‌دا رائەگات و، ئەگەر بە یەکجاری، لە بەر هەر هۆیەک بێ، لە کاردا نەما سەرۆکی ئەنجومەنی نیشتمانی جێگەی ئەگرێتەوە بەو مەرجەی لە ماوەی 60 رۆژدا هەڵبژاردنی سەرۆکی نوێ بکرێتەوە.

6. سەرۆک، سەرۆکی باڵای دەسەڵاتی کارگێڕیی هەرێمی کوردستان ئەبێ، وتەبێژ و، نوێنەریان ئەبێ لە ناوەوە و دەرەوەی کوردستان و، هاوئەهانگیکاری نێوان

حکومەتی هەرێم و حکومەتی ناوەندی ئەبێ... جگە لە دەسەڵاتەکانی تری کە لە قانونەکەدا نوسراون.

«»

لە ماوەی تەنگوچەڵەمەی سەرۆکایەتی دا، رەفتاری پارتی لە گەڵ یەکێتی وەکو رەفتاری "براوە" بوە لە گەڵ "دۆڕاو"، لە کاتێک دا هەر کەس بگەڕێتەوە بۆ کۆی ئەو دەنگانەی دراوە بە ئەنجومەنی پارێزگاکانی دهۆک، هەولێر، سلێمانی، سەرەڕای هەمو ئەو کارە ناقانونی‌یانەی لە هەندێ شوێن بە ئاشکرا کرابون، ئەزانێ دەنگەکانی یەکێتی زۆرتر بون لە هی پارتی.

لە بەر ئەوە ئەگەر هەر باسی ئەوە بکرێ، لەم پرۆسەیەدا لە پێناوی بەرژەوەندە باڵاکانی کوردا، کام حیزب قوربانی داوە و، کام حیزب دەسی لە دەسکەوتی حیزبیی هەڵگرتوە و، کام حیزب دەسکەوتی حیزبیی بە دەس هێناوە، بە وەرگرتن و وەرنەگرتنی پلە و پایە بەرزە رەسمی‌یەکانی کوردستان دا دەرئەکەوێ.

ئەو شێوە رەفتارەی پارتی لە گفتوگۆکانی دا لە گەڵ یەکێتی بە کاری هێنا، بۆ سەپاندنی مەرجەکانی خۆی و داڕشتنی رێککەوتنێکی لاسەنگ، بە عەرەبی پێی ئەلێن "ئیبتیزازی سیاسی". بە کوردی هێشتا ناوی نیە.

تەنگوچەڵەمەی سەرۆکایەتی هەرێم کۆتایی هات، بەڵام "چاوەڕوانی‌یەکانی خەڵک" و "نیگەرانی‌یەکانی خەڵک" لە دامەزراوەکانی هەرێم لە جاران زۆرتر بون... (تەواو)

#

**پاشکۆ (١): یادداشتی هەندێ لە ئەندامانی مەکتەبی سیاسی**
**بۆ سکرتێری گشتی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان**

گەورەی بەڕێز! مام جەلال،
سکرتێری گشتی یەکێتی‌ی نیشتمانی‌ی کوردستان
پاش سڵاو و رێز

ماوەیەکی زۆرە ئەمانەوێ هەندێ مەسەلە کە پێوەندی بە چارەنوسی کورد و یەکێتی‌یەوە هەیە باس بکەین، بەڵام بەراستی جەوی کۆبونەوەکانی مەکتەبی سیاسی کە بەڕێز سکرتێری گشتی جۆرێ لە "ئیرهابی فیکری" بە سەردا سەپاندوە بە هیچ جۆرێ بە کەڵکی ئەم جۆرە گفتوگۆیانە نایەت، چونکە کۆتایی‌یەکەی بە شەڕ و تێکچون و دەنگەدەنگ تەواو ئەبێ. بۆیە بە چاکمان زانی بیروبۆچونەکانی خۆمان بە نوسین بخەینە بەرچاوتان.

یەکێتی، ئەو رێکخراوەی کە زۆری ئێمە ساڵانێکی زۆری تەمەنی لە دامەزراندن و بەهێزکردن و رێکخستنی‌دا بە سەر برد، ئیستا بۆتە دەسکەلایەکی بێ گیان بە دەس سکرتێری گشتی‌یەوە بە ئارەزوی خۆی هەڵی ئەسوڕێنێ، بێ ئەوەی ئەندامانی مەکتەبی

سیاسی و دەستەی کارگێڕەکەی و ئەندامانی کۆمیتەی سەرکردایەتی و دەزگاکانی هیچ دەورێکیان هەبێ لە داڕشتنی بڕیارە سیاسی، ڕێکخراوەیی، پێشمەرگەیی‌یەکانیدا.

1. سکرتێری گشتی، بە تەنیا خۆی بەرپرسی کاروباری دارایی یەکێتی‌یە. جگە لە خۆی هیچ ئەندامێکی تری سەرکردایەتی نازانێ یەکێتی چی هەیە و چەندی هەیە و لە کوێیە و لە لای کێیە و سەرچاوەکەی کوێیە و چۆن سەرف ئەکرێ؟ بۆ قازانجی کێ بازاڕ و بازرگانی و قۆنتەراتی پاوان کردوە؟

2. سکرتێری گشتی، بە تەنیا خۆی بەرپرسی کاروباری دەرەوەیە، بە ئارەزوی خۆی سەفەری ولاتان ئەکا، گفتوگۆ لە گەڵ ولاتان ئەکا، پێوەندی لە گەڵ ئەم دەوڵەت دائەمەزرێنێ و لە گەڵ ئەو دەوڵەت تێکی ئەدا. نوێنەرانی یەکێتی لە ولاتان دائەنێ و لائەبا. قسەی ناکۆک و ناساز بۆ دەزگا جیهانی‌یەکانی ڕاگەیاندن ئەکا.

3. سکرتێری گشتی، بە تەنیا خۆی بەرپرسی کاروباری ڕێکخستنە، بەرپرسی کاروباری ڕێکخراوە دیمۆکراتی‌یەکانە، بەرپرسی کاروباری هێزی پێشمەرگەیە. فەرماندەیی، ئەندامانی مەکتەبەکان، مەڵبەندەکان، کۆمیتەکان، خۆی دایان ئەنێ و خۆی لایان ئەبا. دڵسۆزی بۆ یەکێتی، لێوەشاوەیی، ڕابوردوی باش، دەس و دەم و داوێنپاکی هیچ نرخێکی مادی یا مەعنەوی‌یان نەماوە، دڵسۆزی بۆ سکرتێری گشتی و گوێڕایەڵی کوێرانەی جێبەجێ کردنی فەرمانەکانی بۆتە مەرجی هەرە گرنگی بەرزبونەوە و هەڵکشان بەرەوژور.

4. سکرتێری گشتی، بە تەنیا خۆی گفتوگۆ لە گەڵ حیزب و ڕێکخراوەکان ئەکا و، بڕیاری ئاستی پێوەندی و جۆری هاوکاری و ڕێککەوتن و ئەندازەی یارمەتی‌یان ئەدا.

5. سکرتێری گشتی، بە تەنیا خۆی بەرپرسی کاروباری ڕاگەیاندنە، بەرپرسی ڕۆژنامە، رادیۆ، تەلەفزیۆنە. نوسەر و بێژەرەکانی تەنانەت تەکنیککارەکانی بە ئارەزوی خۆی ئەهێنێ و ئەگۆڕێ. ڕەنگە دەزگای ڕاگەیاندنی یەکێتی تەنیا دەزگا بێ لە هەمو ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست دا، کە سکرتێری گشتی ڕۆژانە خۆی وێنەکانی خۆی و میوانەکانی و هەواڵەکانی بۆ بلاوکردنەوە لە دەزگاکانی ڕاگەیاندن دا هەڵئەبژێرێ.

6. سکرتێری گشتی، بە تەنیا خۆی بەرپرسی کاروباری حکومەتە، وەزیر و وەکیلی وەزیر و سەفیر و مودیری عام دائەنێ و ئەگۆڕێ. جگە لە خۆی کەس بۆی نیە لە وەزیرەکان و لە کارە باش و خراپەکانیان بپرسێتەوە.

7. سکرتێری گشتی، بە تەنیا خۆی بێ ئەوەی پرس بە سەرکردایەتی یەکێتی بکا، بەشدار بو لە نوسین و پەسندکردنی "قانونی ئیدارەی دەوڵەتی عیراق" دا، بە تەنیا خۆی بە خاوەن بڕیار ئەزانێ لە دیاریکردنی خواستەکانی گەلی کورد و چارەنوسی کەرکوک و ناوچە کوردستانی‌یەکانی دەرەوەی هەرێم و، جۆری بەشداری لە حکومەتی ناوەندی‌دا.

×

له ناو یەکێتی‌دا، ژیانی دیمۆکراتی حیزبایەتی، سەرکردایەتی بەکۆمەڵ، ڕێزگرتنی ئیرادەی زۆرایەتی، ڕێزگرتنی ئازادی بیروبۆچون، نەماوە. یەکێتی بەرەو ئەوە ئەبا بیکاتە حیزبی بنەماڵەکەی خۆی. بێ باوەڕی لە نێوان ئەو و ئەندامانی سەرکردایەتی و بنکە ڕێکخراوەییەکانی‌دا دروست بوە. هیچ ئەندامێکی یەکێتی لە هیچ کۆبونەوەیەکی یەکێتی دا کە سکرتێری گشتی سەرپەرشتی بکا یا بەشداری بێ ناتوانێ بیروبۆچونی خۆی بە سەربەستی بڵێ، چونکە سڵ ئەکاتەوە لەوەی سکرتێری گشتی لە ناو کۆبونەوەکەدا بچێتەوە بە گژی‌دا و بیشکێنێ و سوکایەتی پێ بکا.

ئەمانە هەموی بۆتە هۆی پەیدابونی تاقمێ ئەندامی موونافیق و دوڕو و درۆزن لە دەوری سکرتێری گشتی هەلومەرجی ڕاستەقینەی گیروگرفتەکانی یەکێتی و ناڕەزایی خەڵکی لێ ئەشارنەوە، ڕاپۆرتی درۆ و هەواڵی ناڕاستی بۆ ئەهۆننەوە.

له ئەنجام دا، گەندەڵی دارایی، گەندەڵی سیاسی و گەندەڵی کارگێڕی و بەڕێوەبەرایەتی، تەنانەت گەندەڵی خووڕەوشت، سەرانسەری داودەزگاکانی حیزب و حکومەتی گرتۆتەوە بە جۆرێ کە بۆتە هۆی ناڕەزایی گشتی خەڵک و زۆری ئەندامەکانی یەکێتی و بۆتە مەترسی‌یەکی ڕاستەقینە بۆ سەر یەکێتی و پاشەڕۆژی.

بۆیە ئێمە بە پێویستمان زانی بەوپەڕی سەربەستی‌یەوە بەم یادداشتە بیروبۆچونەکانی خۆمانتان بۆ بنوسین و، پێشنیارەکانی خۆمان بۆ چاککردنی ژیانی ناوخۆی یەکێتی، کە کلیلی چاککردنی زۆر بواری تری ژیانی سیاسی حیزبی و حکومەتی‌یە، بخەینە بەر چاوتان. پێشتریش کە بەم ئاشکراییە باسمان نەکردوە هۆکەی ئەگەڕێتەوە بۆ ئەو مەترسی‌یە گەورانەی هەڕەشەیان لە جوڵانەوەی کورد و یەکێتی ئەکرد.

سکرتێری گشتی تەمەنی لە 70 ساڵ تێ پەڕیوە، کاتی ئەوە هاتوە ئیتر وەکو "ڕەمزێکی بەڕێز" خۆی لە دەستێوەردانی ئیشوکاری ڕۆژانەی یەکێتی بکێشێتەوە و، ڕاپەڕاندنی کاروباری ڕۆژانە بە جێ بهێڵێ بۆ هاوڕێکانی و، ڕێگە بدا بە یەکێتی بگەڕێتەوە سەر کارکردن بە پێی سەرەتا ڕێکخراوەییەکانی و، لە داهات و خەرجی دارایی یەکێتی‌دا پێڕەوی ڕونی "شەففافیەت" بکا و، سەروەت و سامانی یەکێتی و سەرچاوەکانی داهاتی ئاشکرا بکات.

له کۆتایی‌دا ئەڵێین: ئێوە ئەگەر هەر سور بن لە سەر درێژەپێدانی ڕێبازی پێشو لە شێوەی بەڕێوەبردنی کاروبارەکانی یەکێتی و حکومەت دا و، ئەگەر بتانەوێ ئیشوکارەکانی یەکێتی و دەسەڵاتەکانی بە شێوەی ئیستا لە دەستی خۆتان دا بهێڵنەوە، بێ ئەوەی هەوڵی جدی بدەن بۆ چارەسەر کردنی بنەڕەتی‌ی ئەو تەنگوچەڵەمەیەی یەکێتی تیا ئەژی، ئەوا ئێمە کە ماوەیەکی درێژ هاوبیروباوەڕتان بوین لە کاری سیاسی و هاوسەنگەرتان بوین لە کاری پێشمەرگایەتی‌دا، لێرە بە دواوە چیتر باری لێپرسراوێتی مێژوویی‌تان لە گەڵ هەڵناگرین، خۆمان "مینبەرێکی ئاشکرا" دروست ئەکەین بۆ چاککردنی وەزعی یەکێتی و ئێمە ئیتر خۆمان بە ئازاد ئەزانین لە

هەڵبژاردنی هەر شێوەیەکی کاری سیاسی کە خۆمان بە چاکی بزانین بۆ قازانجی گەل و نیشتمانەکەمان و یەکیتی‌ی نیشتمانی‌ی کوردستان.

لە گەڵ رێزی

................

ئەم یادداشتە لە رۆژی ١١ ی ١٠ ی ٢٠٠٤ دا کە درا بە سکرتێری گشتی لە لایەن حەوت ئەندامی مەکتەبی سیاسی و چەندین ئەندامی کۆمیتەی سەرکردایەتی و فەرماندەیی هێزی پێشمەرگەوە ئیمزا کرا بو.

**پاشکۆ (٢): رۆژژمێری هەڵبژاردنەکانی کوردستان**

رۆژی 19 ی 5 ی 1992 هەڵبژاردن لە سەرانسەری ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی بەرەی کوردستانی‌دا ئەنجام درا.

رۆژی 1 ی 5 ی 1994 شەڕی ناوخۆی یەکێتی و پارتی لە قەڵادزەوە دەستی پێ کرد.

بە بیانوی شەڕی ناوخۆ، پارلەمان چەندین جار و بۆ چەندین ساڵ درێژەیان بە تەمەنی خۆیان دا، حیزبەکان نەیان ئەویست هەڵبژاردن بکرێتەوە چونکە پارلەمان نیوە بە نیوە گوێڕایەڵی دو حیزب بون، هەردو حیزب ئەترسان لە هەر هەڵبژاردنێکی تازەدا ئەو هاوسەنگیە تێک بچێ، ئەندامانی پارلەمانیش ئەیانویست درێژە بە تەمەنی خۆیان بدەن لە بەر ئەوەی موچەی بەرز و زەوی باش و حیمایەی زۆریان هەبو، بە تایبەتی لەو ساڵانەدا کە ئاستی گوزەرانی زۆرایەتی دانیشتوانی کوردستان لە هەلومەرجێکی خراپ دا بو.

قانونی ژمارە 1 ی ساڵی 1995 تەمەنی "ئەنجومەنی نیشتمانی" کە لە تەواو بون دا بو, بۆ 1 ساڵ درێژ کردەوە.

قانونی ژمارە 1 ی ساڵی 1996 تەمەنی بۆ 3 مانگی تر درێژ کردەوە.

قانونی ژمارە 2 ی ساڵی 1996 تەمەنی تا ساڵی 1998 درێژ کردەوە.

قانونی ژمارە 2 ی ساڵی 1998 تەمەنی بۆ هەمیشە درێژ کردەوە.

ئەم قانونانە هیچ بناغەیەکی دەستوری و قانونی‌یان نەبو، تەنیا هۆی سیاسی‌یان لە پشتەوە بو، کە ئەویش بەردەوامی شەڕی ناوخۆ و هەبونی میلیشیای حیزبی بو.

ئەم پارلەمانە مایەوە تا ئەمەریکا عیراقی داگیر کرد و بڕیاری هەڵبژاردنی پارلەمانی عیراقی دا.

×

رۆژی 9 ی 4 ی 2003 هێزەکانی ئەمەریکا گەیشتنە ناوشاری بەغداد، رژیمی بەعس روخا.

رۆژی 13 ی 7 ی 2003 "مەجلیسی حوکم" دامەزرا.

رۆژی 8 ی 3 ی 2004 "مەجلسی حوکم" کە بە بەشداری سەرکردەکانی کورد "قانون ادارة الدولة العراقية للفترة الانتقالية: قاد" نوسی بو، لە مەراسیمێکی تایبەتیدا ئیمزا کرد.

روژی 30 ی 1 ی 2005 هەڵبژاردن لە کوردستان دا، وەکو زۆر شوێنی تری عیراق، بە گەرمی ئەنجام درا. خەڵکی کوردستان بەشدار بون لە هەڵبژاردنی نوێنەرەکانیان دا بۆ هەر 3 دەزگا، لەوانە ئەنجومەنی نیشتمانیی کوردستان.

رۆژی  ی ی 2005 ئەبو پارلەمانی کوردستان بە پێی نیزامی داخلی یەکەم کۆبونەوەی دەس پێ بکا. بەڵام دانیشتنەکە لە سەر داوای پارتی دواخرا.

یەکێتی و پارتی لە گفتوگۆی سەودایەکی سیاسی دا بون بارزانی بێ بە سەرۆکی کوردستان و تاڵەبانی بێ بە سەرۆکی عیراق. پارتی پرۆژەیەکی بۆ قانونی سەرۆکایەتی هەرێم ئامادە کرد بو، کە بە تایبەتی بۆ مەسعود بارزانی نوسرا بو، ئەیویست بە بێ دەسکاری و لێدوان، بە سەر یەکێتیدا بسەپێنێ و، یەکێتی بەرامبەر ئەنجامدانی کۆبونەوەی پارلەمان و یەکخستنەوەی ئیدارە قبوڵی بکا. یەکێتی هەندێ لە مادەکانی تەعدیل کرد. تەعدیلەکان پێوەندییەکیان بە هیچ کەس و کەسایەتییەک و بە هیچ دەسکەوتێکی سیاسی حیزبییەوە نەبو، پێوەندییان بە سەرەتاکانی بیری دیمۆکراسی و جۆری تێگەیشتنەوە هەبو لە ژیانی دیمۆکراتی. پارتی زۆری تەعدیلەکانی قبوڵ نەکرد، بە تایبەتی بنەڕەتییەکانی، ئەیویست وەکو هەبو قبوڵ بکرێ.

رۆژی 24 ی 4 ی 2005 لەساڵیادی بۆردومانی قەڵادزەدا ئەبو یەکەم دانیشتنی پارلەمان دەس پێ بکا بەڵام لە بەر ئەوەی لە سەر قانونەکە پێک نەهات بون پارتی یەکلایەنە کۆبونەوەکەی دوا خست. جارێکی تر بڕیاریان دا

رۆژی 30 ی 4 ی 2005 ئەبو کۆبونەوەکانی دەس پێ بکا، ئەویش لە سەر داوای پارتی دوا خرا بۆ کاتێکی دیاری نەکراو.

یەکێتی ئەیویست کۆبونەوەی پارلەمان نەبەسترێ بەو سەودا سیاسیەوە کە قانونی سەرۆکایەتی هەرێم یەکێ بو لە مەرجەکانی.

پارتی ئەیویست تا قانونی سەرۆکایەتی تێنەپەڕێنێ و هەمو مەرجەکانی قبوڵ نەکرێ نەهێڵێ کۆبونەوەی پارلەمان بکرێ.

ئەو چەند مانگەی ئەنجومەنی نیشتمانیی کوردستان کۆنەبوەو و، پرۆسەی سیاسی لە کوردستان دا کۆسپی تێ کەوت بو، کێشەی سەرەکی نێوان یەکێتی و پارتی لە سەر ئەوە نەبو کێ سەرۆکی هەرێم بێ، بەڵکو لە سەر ناوەرۆکی "قانونی سەرۆکی هەرێم" بو. پارتی پێی دائەگرت کە هەتا هەردو سەرکردایەتی پارتی و یەکێتی لە سەر قانونەکە رێک نەکەون، ئەوا:

کۆبونەوەی ئەنجومەنیی نیشتمانیی کوردستان ناکرێ،
ئامادە نین باسی یەکخستنەوەی ئیدارەکان بکەن،
گیروگرفتی ئەنجومەنی پارێزگای کەرکوک بە هەڵواسراوی ئەمێنێتەوە...

پارتی بۆ ئەوەی مەرجەکانی خۆی بسەپێنێ، گفتوگۆکانی یەکێتی - پارتی، تەنانەت تەقەلای ناوبژیوانەکانیشی، راگرت تا گەڕانەوەی تاڵەبانی، وەکو لە دەزگاکانی راگەیاندن دا بڵاویان کردەوە. سەرانی پارتی هیوایان بەو بو "تەنازول" یان بۆ بکات و داواکانیان بسەلمێنێ.

رۆژی 18 ی 5 ی 2005 تاڵەبانی لە بەغدادەوە گەڕایەوە قەڵاچوالان.

گفتوگۆی ناوخۆی یەکێتی و، ئاڵوگۆڕی بیرورا، لە رێگەی نامە و نێردراو و لایەنی سێیەمەوە، لە نێوان یەکێتی و پارتی دا، یان وردتر لە نێوان تاڵەبانی و بارزانی دا، دەستی پێ کرد.

رۆژی 28 ی 5 ی 2005 تاڵەبانی بۆ سەردانی بارزانی بە تەنیا، بێ ئەوەی هیچ کەس لە ئەندامانی مەکتەبی سیاسی لە گەل خۆی ببا، چو بۆ سەلاحەدین. بۆ ئەوەی کۆتایی بە تەنگوچەڵەمەکە بهێنێ و، دەرگای پرۆسەی سیاسی لە کوردستان دا بکاتەوە، مەرجەکانی پارتی، لەوانە رەشنوسی "قانونی سەرۆکی هەرێم" وەکو سەرکردایەتی پارتی ئامادەی کرد بو، سەلماند.

رۆژی 4 ی 6 ی 2005 دوەمین خولی ئەنجومەنی نیشتمانیی کوردستان پاش رابوردنی 4 مانگ لە تەمەنی دەستی کرد بە یەکەمین کۆبونەوەی.

رۆژی 8 ی 6 ی 2005 قانونی ژمارە 1 ی ساڵی 2005 ی سەرۆکایەتی هەرێمی کوردستانی عیراقی پەسەند کرد.

رۆژی 12 ی 6 ی 2005 مەسعود بارزانی هەڵبژارد بە سەرۆکی هەرێمی کوردستانی عیراق.

رۆژی 14 ی 6 ی 2005 مەسعود بارزانی لە بەردەم ئەندامانی ئەنجومەنی نیشتمانیی کوردستان و، کۆمەڵێ میوانی کورد و عیراقی و بێگانەدا، سوێندی یاسایی سەرۆکایەتی هەرێمی خوارد.

رۆژی 4 ی 6 ی 2009 تەمەنی پارلەمان کۆتایی ئەهات.

لە ماوەی 4 ساڵی تەمەنی دا ئەیتوانی دەستور و هەمو ئەو قانونەی کە پێویست بون بۆ رێکخستنی ژیان لە کوردستانی عیراق دا بخاتە بەر باس و تاووتوێ و گفتوگۆی تێروتەسەل ئینجا بڕیار لێدان، کەچی هەمو ئەوانەی هەڵگرت بۆ رۆژانێ کە ماوەی قانونی لە تەواوبون دا بو یا بە سەر چو و، لە چەند رۆژێکی کەم دا هەمویانی تێ پەڕاند.

رۆژی 11 ی 5 ی 2009 قانونی پارێزگاکانی پەسەند کرد.

رۆژی 13 ی 5 ی 2009 ماوەی سەرۆکایەتی هەرێم و ماوەی خولی پارلەمانی درێژ کردەوە و یاسای هەڵبژاردنی پارلەمانی هەموار کرد.

رۆژی 16 ی 6 ی 2009 بودجەی ساڵی 2009 ی هەرێمی پەسەند کرد.

رۆژی 24 ی 6 ی 2009 دەستوری هەرێمی کوردستانی بە زۆرایەتی 96 دەنگ پەسەند کرد.

**#**

**پاشکۆ (٣):**

**کۆپی رێککەوتنەکان و هەندێ لە نامەکان**

1–**رێکەوتنی نێوان مەسعود بارزانی و جەلال تاڵەبانی** 2004–12–1

2–**نامەی مەسعود بارزانی بۆ مام جەلال** 2005–2–1

3– **نامەی مەسعود بارزانی بۆ مام جەلال** 2005–5–25